

قادر عەبدوڵڵا

# کوردەکان دەڵێن چی؟

وەرگێڕانی
سەلاحەدین بایەزیدی

دەزگای ئایدیا بۆ فکرو لێکۆڵینەوە



خاوەنی ئیمتیاز: دەزگای ئایدیا
لێپرسراوی دەزگا: ئەنوەر حسێن



سەرپەرشتیارانی پرۆژەی چاپکردنی کتێب
ئەرسەلان حەسەن بابان ئەنوەر

# کوردەکان دەڵێن چی؟

قادر عەبدوڵڵا

وەرگێڕانی: سەلاحەدین بایەزیدی

2018

# کوردەکان دەڵێن چی؟

بابەت: یاداشت
ناوی نووسەر: قادر عەبدوڵڵا
وەرگێرانی: سەلاحەدین بایەزیدی
دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەمەد
هەڵەچن: نیاز کەمال- کەیوان عومەر- ئاسان عەبدوڵڵا
تیراژ: 500 دانە
ساڵی چاپ: 2018
چاپ: چاپخانەی حەمدی
نرخ: 5000 دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( 1436 )ی ساڵی 2018 ی پێدراوە

**سەرچاوەی ئەم کتێبە:**

کردها چه میگویند؟!، قادر عبداله

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا
زنجیرە (288 )

www.ideafoundation.co
2018idea@gmail.com
www.facebook.com/dezgai.idea
07705996990 - 0533220180
سلێمانی - گردی سەرچنار- لە نزیک کۆمەڵگەی بەهاران

# کوردەکان
# دەڵێن چی؟

قادر عەبدوڵڵا
وەرگێڕانی: سەلاحەدین بایەزیدی

2018

کوردستانم نەدەناسی، ڕۆیشتم تا بیناسم تەنیا شتێک کە کردم ئەوە بوو دەسبەجێ چوومە نێو خەڵک، ئەمەی ئێستاش نووسیومە دەگەڕێتەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەم لەگەڵ ئەوان، هەر ئەوەندە.

قادر عەبدوڵلا

ئەم نامیلکەیە ئەگەر بایەخێکی هەبێت، پێشکەشە
بە ڕۆڵە باشەکانی کورد.
ئەو ڕۆڵە باشانەی هەر ئەم ڕۆژانە چەند
کەسێکیان وەک دژە شۆڕش درانە بەر دەستڕێژ.
پێشکەشە بە ڕۆڵەی باشی وەک:
کاک فوئاد (کە بە حوکمی دادگای فاشیستی
گوللەباران کرا.)
بۆ:
کاک ناجی (کە شانبەشانی دلێرانی تری کورد بۆ
شەڕی پارتیزانی ڕووی کردووەتە شاخ.)
بۆ:
کاک محەممەد (لە شنۆیە.)
بۆ:
کاک مستەفا (لە وەتەمیش، دێهاتێکی نزیک
مەهاباد.)
کە چیتر هەواڵێکیان لێ نازانم.

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزمدا
قادر عەبدوڵڵا
خەرمانانی **1358** ی هەتاوی

# نـــاوەرۆك

## بەرەو مەریوان

بۆم دەرکەوت باشترین ڕێگە بۆ ناسینی کوردستان ئەوەیە بڕۆم و ئەوێ لە نزیکەوە ببینم، بۆیە جانتاکەم دەست دایە و کەوتمە ڕێ، سەرەتا نەمدەزانی لە کوێوە دەست پێ بکەم، دوای ڕووداوەکان کەوتم، ڕەنگە ئەمە ڕێگەیەکی باش نەبێت بۆ ناسینی کوردستان، بەڵام لەمە زیاتر هیچم لە دەست نەدەهات.

دوێنێ (1979) لە مەریوان کوشت و بڕ بووە، ڕادیۆ دەڵێت مەریوانییەکان سیانزە پاسداریان کوشتووە، دەڵێت پاسدارەکانی ئێمە خۆشاوی شەهادەتیان نۆشیوە، دەڵێت دەچنە بە هەشت و گومانی تێدا نییە لە قەراغ حەوزی کەوسەر لێو تەڕ دەکەن، ئەمنیش دەچمە مەریوان، دیارە لەوێ هەندێک شت ڕوو دەدا.

ئەمڕۆ گەیشتمە سنە، حەپەساو و دەستەوەستانم، چاوەڕوانی شتێکی نائاساییم کە چاوم بە هیچ ناکەوێت، پەنا بۆ خەیاڵ دەبەم:

کاتێک دەچیتە نێو شاری سنە و ڕوو دەکەیتە قاوەخانەیەک، کە چاوت بە قەڵافەتی ژن و پیاوی کورد دەکەوێت، بە خۆت دەڵێتی گەلی کورد، سەربەستی، ئازادی، یان هەرچی بیەوێت، بە دەستی دێنێت.

هەڵبەت دیارە قسەیەکی زلم کردووە، چونکە خۆ بە چوونە نێو قاوەخانەیەک و بینینی هەندێک کەس بە جلی کوردییەوە

ناتوانی یەکسەر فەتوا بدەیت و خێرا بەو ئاکامە بگەیت کە چییان پێ خۆش بێت بە دەستی دێنن، کاتێک زیاتر دەچیتە پێش و بەرە بەرە ئاشنا دەبیت بە مێژووی خەباتی گەلی کورد، بۆت دەردەکەوێت چەندە دوور بوویت و دواتر پەی بە هەڵەکەت دەبەیت.

کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆیە، ڕادیۆ هەواڵەکان دەخوێنێتەوە، کوردەکان پۆل پۆل لە دەوری ڕادیۆ کۆبوونەتەوە:

«لە مەریوان دۆخەکە ئاڵۆزە».

ئیتر چاوەڕێ نابم. خۆم دەگەیەنمە گەراج، بە پاسێک بەرەو مەریوان دەکەومە ڕێ کە ئامادەی ڕۆیشتنە و لە موسافیر جمەی دێت و گەرمای ناوی دەتپێشێنێت.

لەسەر نەخشە، مەریوان و سنە مەودایەکی ئەوتۆیان نییە، پێت وایە هەرە زێدە سەعات و نیوێک دەخایەنێت، بەڵام کاتێک سواری پاس دەبیت و دەکەویتە ڕێ و دونیایەک پێچ و دۆڵ و سەراوژێر و دەستەو هەوراز و تەپوتۆز تێدەپەڕێنیت، دەبینیت پێنج کاتژمێرە

لە ڕێ دایت و هێشتا نەگەیشتوویتە مەریوان. لە نزیک شار، پاسەکە بەڵایەکی بەسەر دێت و دەوەستێت، ڕێبوارە گەرمابردووەکان لە پاسەکە دێنە دەر و بە ناچاری، لە ژێر ئەو تاوەدا بڵاو دەبنەوە، تۆز سەر و پۆتەڵاکی هەموویانی داپۆشیوە. لەگەڵ یەک دوو موسافیری دیکە دەست لە بارهەڵگرێکی بچووک هەڵدێنین و بەرەو شار دەڕۆین. شۆفیرەکە کوردە و لەگەڵ ئەوانی تر بە کوردی قسە دەکات، لە قسەکانیان ناگەم، بەڵام دەبێت شەڕوپێکدادان کۆتایی هاتبێت. لە پڕێکدا، شۆفێرەکە کە تێدەگات من غەریبەم و سەرودەر لە قسەکانیان دەرناکەم، بە فارسییەکی دەست و پێ شکاو دەڵێت:

«تێدەگەی؟ شەڕی نێوان جووتیار و خومەینییە».

«کۆمیتە و ئاغاکان دەیانەوێت بمانکووژن».

ئەوجا بە دەنگێکی بەرزتر ئێژێ:

«ئێمە خومەینیمان ناوێت، سەربەستیمان دەوێت».

بارهەڵگرەکە خێرا لە شار نزیک دەبێتەوە.
کە بە نێو شاردا پیاسە دەکەی، زوو بۆت دەردەکەوێت هەندێک شت لە گۆڕێیە. لاوان بە چەکی سەر شانیان، بە خەنجەر و نارنجۆک و فیشەکی نێو قەدیان دێن و دەچن و پاسەوانی دەکەن، بەڵام جگە لەم پیاوە چەکدارانە کە لە سۆنگەی غەریبەوە نائاساییــن، هەموو شتەکانی تر ئاسایی و ئارامن. ژنان بە جلی خۆماڵییەوە لە نێو شار دەبینرێن، ژمارەی ئۆتۆمبێلەکانی سەر شەقامەکان پەنجەکانی قامک تێناپەڕێنێت، زۆربەیان بارهەڵگری بچووکن و خەڵک لە گوندەوە دێنن بۆ شار.
ڕیزێک منداڵ لە بەردەم دوکانێکی گچکە دانیشتوون و هەر کامە و کارتۆنێکیان بە دەستەوەیە، پیاوێک لە پشت ئامێرێکی کارەبایی دانیشتووە و پەشمەک دروست دەکات. منداڵەکان هەموویان لە بێکارییان پەشمەکی دەفرۆشن، منداڵێکی پەشمەک فرۆش خەریکە ڕاگەیەندراوی ڕووداوەکانی مەریوان بۆ خاوەن دووکانەکە دەخوێنێتەوە.

منداڵەکان پەشمەکێک بە قڕانێک دەکڕن و دوو دانە بە پێنج قڕان دەفرۆشن، بەڵام پێش ئەوەی هەموویان بفرۆشن، هەندێکیان دەپڕووکێن، یان لەبەر تاوێ دەتوێنەوە.

پیرەمێردەکان لە بن دیوارەکان ڕاوەستاون، غەریبێک لە نێو شاردا زۆر زوو دەناسرێتەوە. هەر بۆیە چەند چەکدارێک ئابلۆقەم دەدەن:

«هەواڵنێری؟»

هەموویان گەنجن، وێدەچێت قوتابی دواناوەندی بن، هەڵسوکەوتیان دۆستانەیە.

- نا، هەواڵنێر نیم، موسافیرم، بۆ خۆم دەنووسم.

- با بڕۆینە بنکە، گەنجە تێگەیشتووەکان هەموویان لەوێن، یارمەتیت دەدەن.

نازانم بنکە کوێیە و چییە، بەڵام تێدەگەم بنکە هەمان شورای هەرێمی و جەماوەریی شاری مەریوانە، هەر ئەو شورایەی خەڵکی شار لە سەر چاویانی دادەنێن، بەڵام دەوڵەتیان قبوڵ نییە. بنکە، ناوەندی چالاکی و فەرماندەیی شاری مەریوانە. بەرەو بنکە هەنگاو دەنێین،

ژن و منداڵ لە بەر دەرکە و پەنجەرەکان دانیشتوون و دەڵێتی هەموان چاوەڕوانی کەسێکن کە ڕاستییەکانی ڕووداوەکانی مەریوانی بۆ باس بکەن و ئەویش ئەم ڕاستییانە بە گوێی ئەوانی تر بگەیەنێت.

- کاکە ڕادیۆ درۆ دەکات.
- دەزانم.
- کاکە ئێمە هەموومان یەکین، ئێمە بەس دەڵێتین با خۆمان شارەکەی خۆمان بەڕێوە بەرین، پاسداری بێگانە مەنێرن، بەڵام گوێ نادەنێ، دەیانەوێت هەر چۆنێک بووە شەڕ بەرپا بێت. دەیانەوێت بیانوویەک بدۆزنەوە، هەڵبکوتنە نێو شار، هەنجن هەنجمان بکەن و چەکەکانمان لێ زەوت بکەن.
- بەڵێ، تێدەگەم.

دەگەینە بنکە، شوێنێکە لە بینای قوتابخانەیەک دەچێت، لە وانەشە پێشتر هۆڵی فریاگوزاری بووبێت، حەوشەکە پڕە لە پیاوانی چەکدار، هەموویان حازر و ئامادەن. ئەو گەنجەی ڕێنوێنمە، پێم دەڵێت:

"ئەمانە کۆمەڵێک پێشمەرگەن کە لە سەرانسەری کوردستانەوە هاتوون، زۆربەیان جووتیارن، پێشمەرگەی یەکێتیی جووتیارەکان، خوێندکار و قوتابیشیان لەگەڵە. لە هەر شوێنێکی کوردستان پێکدادان ڕوویدات، لە یەکێتییە جووتیارییەکان، لە سازمانی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان، کۆمەڵەی زەحمەتکێشان و لایەنگرانی پارتیزانە فیداییەکانەوە پێشمەرگە دێن و دژ بە دوژمن دەجەنگن".

خەریکە لە هەندێک شت حاڵی دەبم، بەڵام سەرەدەر لەو ناوانە دەرناکەم کە هێنانیە زمان، دواتر وردە وردە لێکیان دەکەمەوە. ڕێنوێن دەمباتە نووسینگەی شوڕا و بە کوردێکی چەکداری باڵابەرزم دەناسێنێت کە سەراپای گیانی نوقمی چەک و گولله و قونبەلەیە.[1]

بە خۆمدا دەشکێمەوە، چونکە دەزانم شایەنی ئەوە نیم ئەم خەڵکە تێکۆشەرە

---

1 ئەم پیاوە چەکدارە کاک فوئادە کە بە بڕیاری دادگای فاشیستی گوللەباران دەکرێت.

ئەوەندە ڕێزم بگرن، هەروەها لەبەر ئەوەی نازانم چ لەو لاوانە بپرسم، لە کوێوە دەست پێ بکەم، پیاوە کەڵەگەتەکە دەستم دەگوشێ و بەخێرهاتنم دەکا، پاشان بێدەنگی وەک مۆتەکە بەسەرماندا زاڵ دەبێت، ئەخر بە پێی نەریت من دەبێت قسە بکەم، شتێ بپرسم، شیکردنەوەیەک بدەم، یان بڵێم لەم بگرەوبەردەیەدا بۆچی هاتووم، کەواتە بێدەنگی سوودێکی نییە، دەپرسم "کاکە، لێرە چ باسە، مەسەلە چییە، دەتوانن بۆم باس بکەن؟" هەرچی بێ ئەو بۆم شی دەکاتەوە، بەشێک لە قسەکانی یادداشت دەکەم، بەڵام بۆ ساتێک لە بیرم ناچێت کە ئەو هەمووە ڕێگەیەم بڕیوە بۆ ئەوەی بزانم چ لە دەوروبەرم ڕوودەدات، کاتێک ئەو پیاوە، یان کەسێکی دیکە قسەم بۆ دەکات، گوێقوڵاغ دەبم تاوەکو شتێک فێر ببم، هەر ئەمە و بەس، قەت هیچ بانگەشەیەکی ترم نەبووە. پیاوەکە دەڵێت:

"ملکدارەکان خودان دەسەلاتێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوون، خەبات دژ بە ڕژێمی شا

هەرگیز بەشێکی دابڕاو نەبووە لە خەبات دژ بە فیۆدالیزمی هەرێمی".

ئەها، کەوابێت ئەمانە وەکچۆن دژ بە ڕژێمی شا شەڕیان کردووە لە فیکری بنبڕکردنی فیۆدالەکانیش دابوون، دەی چیتر؟

"دیارە کۆنەپەرستەکانی لە مەڕ خۆمان و فیۆدالەکان تا ڕۆژی شۆڕش لایەنگری شا بوون، کە شا ڕۆیشت، پشتی بەختیاریان گرت و هەر کە شۆڕش سەرکەوت، ئەوان پێگەیان نەما و کوون بە کوون بە دوای پاڵپشت و یاریدەدەرێکدا گەڕان، ئەم پاڵپشتە ئیمپریالیزم بوو، بەڵام دەبوایە داردەستەکانی بە هانای ئەم دەرەبەگانەوە بێن، کە داردەستی ئیمپریالیزم، شای بەکرێگیراو ڕووخا و بەختیاریش هەڵات، دەبوایە هەرچی زووە ئەم داردەستە بدۆزرێتەوە، دەبوایە دوای شا هاوپەیمانێکی تر خۆی ناساندبا و بە سەرنجدان بە دەوڵەتی نوێ و حکومەتی ناوەندی توانیان هاوپەیمانەکانی خۆیان لە

ڕیزی ڕێبەریدا بدۆزنەوە، ئەم هاوپەیمانانە لە لایەن ئیمپریالیزمەوە دەستنیشانکرابوون و پێشوەختە بڕیارەکان دەرکرابوون".

"کۆنەپەرستەکان سەرەتا شان بە شانی شا جووتیارەکانیان دەچەوساندەوە و دوای شا، هاوپەیمانی نوێیان لە نێو پیاوانی دەوڵەت و کومیتەکاندا بینییەوە، ئەوانە پاش ڕۆیشتنی شا بوونە موسڵمان و لایەنگری پلە یەکی شۆڕشی ئیسلامی..."

"دەوڵەتیش دەستی ئەم نەوموسڵمانەی گوشی و چەک و چۆڵی پێ دان، فیۆداڵەکان خەیاڵی پووچی گرتنەوەی دەسەڵات و درێژەدان بە چەوسانەوەی وەرزێرەکانیان کەوتەوە سەر، بەڵام ئەم جارەیان وەرزێرەکان زوو وەخۆ کەوتن، لە بەرامبەر یەکگرتنی دەرەبەگەکان، چەند یەکێتییەکیان دروستکرد و چەکیان هەڵگرت، بەم جۆرە ڕێکخراوتر بوون و بە توندی وەڵامی دوایین دەستدرێژی دەرەبەگەکانیان دایەوە، سەلماندیان کە بە ڕاستی دەرەبەگایەتی لە ڕوانگەی مێژووییەوە

لە ناو چووە، لە ڕوانگەی سیاسییەوە دابڕاوە و هێزێکی لەرزۆکە".

"پێکدادانەکانی ئەم دواییانەی مەریوان، شەڕی نێوان ئاغاکان و پاسدارەکان لە لایەک و هی وەرزێرەکان لە لایەکی تر بوو".

"بە سەرنجدان بە شۆڕشی ئێران و ئەرک و ئامانجە هەنووکەییەکانی ئەم شۆڕشە، ئێمە لە قۆناغێک داین کە ئەم جارەیان دەبێت بە هێزی جووتیاران، دەربەگایەتی لە ناوچەکە بنبڕ بکەین، لێ دەبێت لە زۆر هەوراز و نشێوان تێپەڕ بین، شکست و سەرکەوتن، هاوکات چاوەڕێمانن، ئەوەی ئێستا لە کوردستان لە گۆڕێیە، خەباتی مسۆگەر و چارەنووسسازی نێوان جووتیاری چاوکراوە و پاشماوەکانی فیۆدالیزمی هەڵوەشاوەیە، ئەمە دوایین شەڕێکە لەم بوارەوە ئەنجام دەدرێت و هیچ جۆرە پشتیوانییەکی دەرەکی ناتوانێت بە هانای دەربەگایەتییەوە بێت".

"ئەزموون نیشانی داوە کە لە ماوەی سی - چل ساڵی ڕابردودا، ئیمپریالیزم بۆ

دەرەبەگایەتی نەیتوانیوە پێ بنێتە کوردستان، دەربەگایەتیش نەیتوانیوە بۆ ئیمپریالیزم خۆی بە سەر جووتیاراندا بسەپێنێت، ئێمە ئەم ئەزموونەمان لە مەریوان بە چاوی خۆمان بینی، ئەوانە پاش ئەوەی سەرجەم پیلان و سات و سەودا و کردە دژە شۆڕشگێڕییەکانیان لە نێو هێزە جووتیارییەکان و ئەوانی تردا تووشی شکست بووەوە، بڕیاریاندا لە چوارچێوەی سوپای پاسدارانی شۆڕش و بە پەیوەندیی لەگەڵ هێزە نیوە فاشیستە نێوەندگەراکانی وەک ڕێکخراوی موجاهدینی شۆڕشی ئیسلامی لە مەریوان، یان شوێنەکانی تری کوردستان دەسەلات بە دەستەوە بگرن و هەڵبکوتنە سەر گەلی کورد و گەلانی تری ناوچەکە، بەلام ئەم جارەیان هێزە پێشکەوتنخوازەکان شان بە شانی جووتیارە چاوکراوەکان بەربەرەکانیان کرد و نیازیان وایە دەربەگەیاتی بە خاک بسپێرن، ئەوەی لە مەریوان و لە کوردستان بە گشتی ڕووی دا، هەمووی لەم چوارچێوەیە دایە..".

لـه سـەر قسەکانی بـــەردەوام دەبێت و شیکردنەوەی زیاتر دەدا، منیش بە سەرنجەوە گوێی بۆ ڕادەدێرم. پاشان کە قسەکانی تەواو دەبـن و وەک بڵێی چاوەڕێیـە پرسیارێکی لێ بکەم، من هیچم بۆ گوتن پێ نامێنێت. پێم وابێت لـەم دۆشداماوییەم تێدەگات، لە وانەشە... نـازانـم، هەرچی بێت ئـامـاژە بۆ دەرەوەی پەنجەرەکە دەکات و دەڵێت:

"کوڕەکان لە دەرەوەن، بڕۆ لەگەڵ کێ پێت خۆش بوو قسە بکە. ئەوان دەتوانن یارمەتیت بدەن".

بـەو چاکەیەی دەرهـەق بە من دەیکات، بە پەلە هەڵدەستم و دەچمە حەوشەکەوە، نازانم چ بکەم و لەگەڵ کێ قسە بکەم، هەر ئەوەندە فێر بووم و دەزانم کە لەم کاتانەدا کەمێک سەبر و بێ موبالاتی هەموو شتێک چارەسەر دەکـات. هەنگاو دەنێم، بێگومان هەر چەشنە جموجوڵێکم لە ژێر چاودێری و نیگای وردی پێشمەرگەکان دایە. یەکەم جار کە ناوی پێشمەرگەم بیست، ڕاچەنیم و بە

خۆمم وت کەواتە مەبەستیان لە پێشمەرگە ئەمانەیە. ئاخۆ ئەمانە هەمان ئەو پارتیزانە خەباتگێڕە کوردانەن کە تا دوا دڵۆپی خوێنیان لە ڕێگەی ئۆتۆنۆمی کوردستاندا شەڕ دەکەن؟ بێگانەیەک یەکەم جار بە چاوی ڕێز و ستایشەوە لێیان دەڕوانێت، بەڵام کە کەمێک لە کوردستان دەمێنێتەوە و لە نزیکەوە لەگەڵ خەڵکدا ئاشنا دەبێت، بۆی دەردەکەوێت پێشمەرگە بوون و پێشمەرگایەتی لەم ناوچەیە شتێکی ئاساییە و لە پێناو گەیشتن بە ئازادی، گشت بنەماڵەیەکی کورد ئامادەیە ڕۆڵە گەنجەکەیان لە ڕیزی پێشمەرگەکان دابێت.

بەم جۆرە لە ناو پێشمەرگەکاندا دێم و دەچم، دواجار یەکێکیان دەستنیشان دەکەم و لێی دەچمە پێشی:

"ببوورن کاکە، ئێوە کە پێشمەرگەن چیتان گەرەکە وا چەک بە شان حازر و ئامادە ڕاوەستاون؟"

ناوی ئەحمەدە، تەمەنی بیست و پێنج ساڵە، جووتیارە، خەڵکی بندۆڵی هەورامانە، دەڵێت:

"ئێمە دەمانەوێت بژین، وەک ئێوەی فارس، ئاغامان ناوێت، بێجگە لە مە هەر داواکارییەک ئەوانی تر بیانەوێت، ئەمنیش دەمەوێت، بڕۆن لە لاوە خوێندکارەکان بپرسن، بزانن چییان دەوێت، ئەمنیش هەمان شتم دەوێت".

کەواتە دەبێت لە دەرفەتێکدا بچم لە لاوە لە خوێندەوارەکانیان بپرسم و بزانم چییان دەوێت، ئێستا بە چوار دەورمدا کوزیلکەیان بەستووە، لەگەڵ پێشمەرگەیەکی تەنیشتم قسە دەکەم، ئاسنگەرە، ناونیشانەکەیم پێ دەدات و بە شانازییەوە ئێژێ:

"بنووسە... ئاسنگەر، شەقامی بلوار، 56 ساڵم تەمەنە و لە دایکبووی1305م. بنووسە کورد دژی تەزویرە، کەسیش بە دوژمن نازانێت، داوای مافی خۆی دەکات، ئێمە دژی ئاغاکانین، دژی قیادەی موەقەتین. ئەو قیادە موەقەتەی خومەینی بە ڕێی خستووە،

داروودەستەی بارزانی، ئەوانەی لە عەزیمییەی کەرەج لە نێو ڤێلای خۆشدا دەژین، بە فەرمانی خومەینی و بە فەرمانی بازرگان هاتوون، کەوتوونەتە نێو ژیانی ئێمەوە و لە گیان بێزاریان کردووین. بنووسە ئەو قیادە موەقەتانەی بە فەرمانی دەوڵەت هاتوون ئێمە سەرکوت بکەن، دژی خەڵک و دژی ئێران، ئەوانە سەردەمی ساواک، ساواکی بوون و ئێستاش لە لایەن قومەوە پارەیان پێ دەدرێت، خراپەکارن، بەکرێگیراون.

ئەوان خەڵک دنە دەدەن، خەڵکانێک کە خۆیان دەتوانن ئاسایشی شارەکەیان بپارێزن، چ پێویستیان بە قیادەی موەقەتەیە؟ ئەوان مامۆستا باشەکانمان بە بیانووی کۆمۆنیست بوون دەگرن، ئەشکەنجەیان دەکەن و لە گرتووخانەیان دەپەستێون.

ئێمە بێ پوول و پارە سنوورەکان دەپارێزین، ئەمن وازم لە ژیانی خۆم هێناوە و ئەوە شەش مانگە پاسەوانی دەکەم، لەگەڵ ئەوەشدا بە منی ڕیش چەرموو ئێژن

دژەشۆڕش، بەو هیچ و پووچە خراپکارانەی مانگێ دوو هەزار تمەن لە قوم وەردەگرن، دەڵێن موجاهید. بنووسە گاڵتەجاڕییە، ئێمە دژەشۆڕش بین، کوردی ئێرانی دژەشۆڕش بێت، بەڵام قیادە موەقەتی عێراقی موجاهید و پشتیوانی ئیسلام. ئەمانە بنووسە.

خەڵکی مەریوان، خەڵکی کوردستان، ئەگەر دوژمنێک هێرش بکاتە سەر ئێران، هەموویان دڵخوازانە ئامادەن گیانیان فیدا بکەن، ئێمە گیانفیدای ئێران و گیانفیدای کۆمارین، بەڵام کۆمارێک نا کە لە دژی ئێمە بێت، کۆمارێک نا کە لایەنگری دەرەبەگەکان بێت. ئێمە گیانفیدای کۆمارێکی خەڵکین، گشتمان سەربازی ئێرانین، تەنیا ئێران دەناسین و ئێرانمان دەوێت، بۆچی کەس لە مە تێناگات، بۆچی کەس گوێی لە دەنگی ئێمە نابێت، بۆ ئێمە چیمان گوتوە کە هەموان تووڕە بوون، دار میوەیەکە خودا داویەتی و هەموویان دەبێت لە بەرەکەی بخۆن. دەبێت مافی گەلان بدەن، ئێمە بەس مافی خۆمانمان لەو میوەیە دەوێت کە ئێوە

دەی خۆن و جیاخواز نین، ئەمەیان سەد جار بنووسە، ئێمە جیاخواز نین، ئێمە خودامان دەوێت، ئیسلاممان دەوێت، ئێرانمان دەوێت، کوردستانمان دەوێت، لاوەکانی خۆمانمان دەوێت. هیچکاممان دژە شۆڕش نین، شا ئەگەر ئێمەی چنگ کەوتبا لەتوپەتی دەکردین. ئێستاش بووینەتە دژەشۆڕش. بە خوا ئەمن ئاسنگەرم، هەر لەبەر ئەم کۆمارەی سێرە لە لاوەکانمان دەگرێت و دڵیان دەپێکێت، چل هەزار تمەنم زەرەر کردووە، 24 سەعاتە لە ژێر بەفر و باران و گەرما پاسەوانیم داوە، ئێمە ئێرانمان دەوێت، ئێرانێکی بێ فرتوفێڵ، بێ غەل و غەش. ئەوە یانی چی کرێکارێک، جووتیارێک بووەتە دژەشۆڕش و لە بەرامبەردا موفتیزادە بووەتە زانا و شۆڕشگێڕ، قیادەی موەقەت بووەتە موجاهید؟

توخوا ئەمانە بنووسە، بنووسە سەرەدەری لێ دەرناکەین".

پیاوە ئاسنگەرەکە قسەکانی تەواو دەکات، من خەریکە لە هەندێک شت تێدەگەم.

گوێم لە ناوەکانی وەک یەکێتی جووتیاران، قیادەی موەقەت، موفتیزادە، دەرەبەگەکان و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان دەبێت. چەند جارێک گوێم لێ بووە کوردەکان بە شانازییەوە باسی ئەم کۆمەڵەیە دەکەن، باسی پارتیزانە فیداییەکانی گەلیش دەکرێت، بە دڵنیاییەوە پاشان زیاتر لە گەڵیان ئاشنا دەبم. ئێستا بە ئاسانی دەتوانم لەگەڵ پێشمەرگەکان هەڵس و کەوت بکەم، ئیتر پرسیار ناکەم، هەر کەس قسەیەکی پێ بێت، خۆی پێم دەڵێت، پاش ئەوەی پیاوە ئاسنگەرەکە کۆتایی بە قسەکانی دێنێت، پێشمەرگەیەکی تر دێتە پێشێ و لە بن دارێک لە تەنیشتم دادەنیشێت و دێتە گۆ:

"با من پێت بڵێم گەلی کورد چی دەوێت".

بە پەلە قسەکانی دەنووسمەوە کە ڕوو لە من و لەوانی تر دەیانکات:

"من... نوێنەری یەکێتیی جووتیارانی سەقز".

تفەنگێکی ژێ ٣ی لە مل کردووە، جامانەیەکی گەورەی لە سەری بەستووە و دوو ڕیز فیشەکی لە نێوقەدی هاڵاندووە.

دەڵێم:

"نوێنەری کام یەکێتی؟ یەکێتی جووتیاران چییە؟ چۆن دروست بووە؟"

دەڵێت:

"ئێمەی جووتیار بەرامبەر بە یەکگرتنی ئاغاکان یەکێتییەکمان دروستکرد کە لە جووتیاران پێک هاتووە و لە سەرانسەری کوردستان بووەتە خاوەن دەسەڵات و دەستی دەڕوا".

دواتر تێدەگەم کە چیرۆکی دامەزراندنی ئەم یەکێتییە دوور و درێژە. ناوبراو درێژە بە قسەکانی دەدات:

"بڕوانن، هەموو کەسێک لە دونیادا دەبێت نەتەوەی هەبێت، ئێمە خوازیاری ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و دیموکراسی بۆ ئێرانین. ئەو ئۆتۆنۆمییەی بە مافی خۆمانی دەزانین، بۆ هەموو گەلانی ئێرانیشی بە ڕەوا دەبینین.

عـــەرەب، تــورک، کــورد و تــورکمــەن حەقی ئــەوەیــان هــەیە داوای مـافی خــۆیـان بکەن، ئیدانەی گشت ئەو مەرجەع و دەزگایانە دەکەین کە بە جیاخوازمان لە قەڵەم دەدەن، ئەگەر بێت و ئۆتۆنۆمی بدرێت، لە ڕوانگەی جووتیارانی کوردستانەوە، دەبێت دەوڵەتی پەیوەندیدار لەگەڵ نوێنەرانی جووتیـاران و کرێکارانی ئێران پەیوەندی بگرێت، ئێمە ئۆتۆنۆمییەکی ئاوامان پێ ڕاستەقینەیە، نەک ئەوەی دەوڵەت خۆی بیبڕێت و بیدروێت. ئێمەی نەتەوەی کورد بە شایەتی ئەو کردەوانەی ئەنجاممان داون، شێخ عیزەدین حوسێنی بە نوێنەری ڕاستەقینەی گەلی کورد و بە تایبەت کرێکاران و جووتیارانی کوردستان دەزانین و ئەگەر دەوڵەت لەگەڵ کەسێکی تر وەک نوێنەری گەلی کورد پەیوەندیی بگرێت، مەحکوومی دەکەین.

بەڵام ئەم دەوڵەتە بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ ڕووبـەڕووی گەلی کورد نەبێتەوە، هاتووە قیادەی موەقەت و دەرەبەگە هەرێمییەکانی پڕچەک کـردووە و لە گیانی گەلی کـوردی بــەرداون، ئـەوەیـە هـەڵسوکـەوتی دەوڵــەت

بەرامبەر بە ئێمە. لە لایەکی دیکەوە ئێمە بۆمان سەلماوە کە سوپا دژ بە گەلە. بڕۆنە نەغەدە و شوێنەواری تاوانەکانی دەوڵەت بە چاوی خۆتان ببینن. ئەوە هەمان ئەڕتەشی شاهەنشایە. جووتیارانی کوردستان، لە ترسی دەرەبەگ و قیادەی موەقەت و کۆنەپەرستە خۆجێیەکان و سووپا، پارەی نانی منداڵەکانیان داوە بە چەک، ڕۆژ تا ئێوارە کار دەکەن و شەو تا بەیانی پاسەوانی دەدەن. ئەمەیە ئاسایشی جووتیاران لە سەردەمی شۆڕشی نیوەچڵ و دەوڵەتی کاتیدا.

باشتر وایە ئەم دەوڵەتە مشتی خۆی بۆ ئێمە بکاتەوە تا بزانین بە ڕاستی خۆیشی بڕوای بەم شۆڕشە نیوەچڵە هەیە، یان نا، ئەگەر بڕوای پێیە، بۆچی مافی خەڵک نادا؟ ئێمە خودموختاری بە مافی یاسایی و نەتەوەیی خۆمان دەزانین و تا دوایین دڵۆپی خوێن بۆ بەدەستهێنانی دەجەنگین. ئەگەر دەوڵەت بیەوێت بە دانوستان پرسی کوردستان چارەسەر بکات، دەبێت بزانێت

نوێنەری کوردەکان شێخ عیزەدین حوسێنییە نەک کوردفرۆشی وەک موفتیزادە.

بەڵام ئێمە هەموو شتێک دەزانین، دەوڵەتی قوم هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ دەوڵەتی شادا نییە".

پێشمەرگەکە چەکەکەی هەڵدەگرێت، هەڵدەستێتە سەر پێ و دەڵێت:

"ئێمە دەزانین دەبێت جارێک خوێنمان بڕژێتە سەر خاکی کوردستان".

من قسەیەکم پێ نییە بۆ گوتن، بەس گوێ ڕادەدێرم، چەندین سەعات لەگەڵ پێشمەرگەکان قسە دەکەم، ئیتر هەست بە غەریبی ناکەم.

تێگەیشتن لە ڕێبەرایەتی شێخ عیزەدین و پرسی هێنانەگۆڕی موفتیزادە لە لایەن دەوڵەتەوە بە لامەوە ئەستەمە. لە پێشمەرگەیەک کە خوێندکاری کۆلێجی تەکنیکی تارانە، دەپرسم لەم ڕووەوە چۆن بیر دەکاتەوە، ئەو دەڵێت:

"هەنووکە شێخ عیزەدین نوێنەری بەرەی پێشکەوتنخوازە، نوێنەرایەتییەکەی لەوەوە دێت کە شێخ بەرە بەرە، بەڵام پێداگرانە لە کۆنەپەرستی نێوخۆیی دابڕاوە و تێکەڵ بە هێزە پێشکەوتنخوازەکان و بە تایبەت جووتیاران بووە، بەڵام موفتیزادە نوێنەری کۆنەپەرستی نێوخۆییە، ئەو بە پێچەوانەوە، هێدی هێدی لە هێزە پێشکەوتنخوازەکان دابڕاوە و ڕووی کردووەتە کۆنەپەرستی و موڵکدارە گەورەکان، بەم جۆرە دەوڵەت کردوویەتی بە داردەستێک و کوردەکانی پێ سەرکوت دەکات.

هەڵبەت تێکەڵاوی هێزە پێشکەوتنخوازەکان و شێخ عیزەدین تاکتیکێکە بەرامبەر بە بەڕێوەبەرانی قوم و جۆری حکومەتی ناوەندی و کەشوهەوای زاڵ. ئەوەی تر لە سەر شێخ دەمێنێتەوە کە چەندە دەتوانێت لەگەڵ هێزە پێشکەوتنخوازەکان بێتە پێش، هەتا ئێستا باش بووە، بەڵام ئەگەر بێت و کەمێک لادان بێتە گۆڕێ، شتەکە بۆ خۆی چارەسەر دەبێت".

دونیا بەرە بەرە تاریک دادێت، بەڵام هێشتا گەلێک قسە ماون، شت زۆر گوتران، لێ هێشتا سەبارەت بە حیزبی دیموکرات هیچ شتێکم نەبیستووە. ئینجا پرسیار لە هەمان نوێنەری جووتیارانی سەقز دەکەم دەربارەی حیزبی دیموکرات. دەڵێت:

"................................ حیزبی دیموکرات لە دەوروبەری سنە، مەریوان، بانە و سەردەشت لایەنگری نییە. ناوەندی دەسەڵاتەکەی مەهاباد و گوندەکانی دەوروبەری مەهابادە. خەڵکی دێهاتەکانی دەوروبەری مەهاباد و ورمێ و ئەو دەوروبەرانە زۆر لایەنگری لەو حزبە دەکەن.

...................... هێزەکەی هەر لەم دێهاتییانە وەردەگرێت. ئەو هێزەی ئێستا ڕێبەرانی ئەم حزبە هەیانە دەگەڕێتەوە بۆ خەباتی قازی محەممەد، شەریفزادەکان، موعینییەکان و مەلا ئاوارەکان. خەڵک لەبەر ئەمانەیە حیزبی دیموکراتی خۆش دەوێت و لەبەر ئەم قارەمانانەیە خەڵکی دێهاتەکان بە چاوبەستراوی خۆیان بە ئەندامی حزب دەزانن،

بەڵام ئەم سەرکردانەی ئێستا ناتوانن وەک موعینییەکان و شەریفزادەکان دە فکری خەڵکی دابن".

دونیا تاریک ببوو کە لە بنکە هاتمە دەرێ، ویستم بچمە نێو شار و لە موسافیرخانەیەک لا بدەم، پێشمەرگەیەک هاتە پێشێ و گوتی:

- دەچنە کوێ؟
- موسافیرخانە.
- پێویست ناکات بچنە موسافیرخانە. دەچینە ماڵی ئێمە.

بەرامبەر بەو فەرمانەی وەڵامێکم پێ نەبوو. لە تەک چەند کوردێکی تر بەرەو ماڵی پێشمەرگە گەنجەکە کەوتینە ڕێ. بە چەند کۆڵانێکدا تێپەڕ بووین، لە بەر دەم دەرگەیەکی دارینی کۆن پێشمەرگەکە کەسێکی بانگ کرد، ڕەنگ بێت ژنەکەی. ئینجا لە چاوترووکانێکدا ژنێک بە کۆرپەیەکی نێو باوەشییەوە بە دەرکەوت، ژنەکە کراسێکی بریقەداری سووری داوێن فشی لە بەر دابوو، سەری بە پەڕۆیەکی بە زەڕوزەنگیانە بەستبوو.

قژی هۆنیبووەوە و بە دولادا ئاویزانی کردبوو. منداڵەکەی خستە نێو ئامێزی پێشمەرگەکەوە. لەبەر دەرگا ڕاوەستا و بە کوردی دوا، ڕەنگە مانای قسەکانی ئاوا بێت:

"بەخێر بێن کاکە، فەرموون، ماڵی خۆتانە".

چووینە ماڵی پارتیزانە گەنجەکەوە، حەوشەکە تەنگ و تاریک بوو، ژوورەکان بە ڕادەیەک بچووک بوون سێ کەس بە ئاستەم دەیانتوانی تێیاندا ڕابکشێن. زۆری پێ نەچوو ژنە گەنجەکە بە مەجوعمەیەکی پڕ لە خواردن وە ژوور کەوت، برسیمان بوو، تا توانیمان خواردمان. ژنی پێشمەرگەیەکی کورد بە جۆرێک خواردن دروست دەکات کە ئەگەر مێردەکەی هەموو پێشمەرگەکان بێنێتەوە ماڵی دیسان لە هیچی کەم نابێت.

ڕۆژی دواتر بە نێو شاردا پیاسەم کرد، شارەوانی، پۆلیس، دادگا، هەمووی بە دەست لاوانەوەیە. ئەوان بە سواری کامیۆنەکانی سوپا بە نێو شاردا دێن و دەچن و دەروازەکانی شار

کۆنترۆڵ دەکەن. لەگەڵ کەسانی بێگانە بە جوانی هەڵسوکەوت دەکەن، کە چاویان بە تۆی غەریبە دەکەوێت، یەکەم شتێک کە پێت دەڵێن، ئەمەیە:

"دەبینی کاکە، هەمووی درۆیە، ڕادیۆ درۆ دەکات، مەلا درۆ دەکات، پیاوانی قوم هەموویان درۆ دەکەن، سەیرێکی دەوروبەرتان بکەن، بزانن ئێمە مافی خۆمانە چارەنووسی خۆمان دیاری بکەین یان نا؟"

غەریبە چاوێک بە دەوروبەریدا دەخشێنێت و دەبینێت ئەم خەڵکە زوڵملێکراوە، ئەم خەڵکە لە بیرکراوانە ناچارن و هیچ ڕێگەیەکی تریان لە بەردەمدا نییە، دەبێت و دەبێت چەک هەڵگرن، ئەوان پێشمەرگەی چەک بە دەست لە سەر چاویان دادەنێن.

دێهاتییەک دەڵێت:

"ئێمە ئەگەر بزانین پێشمەرگەیەک دێتە نێو دێ، بەرەو پیری دەچین و ڕێزی لێ دەگرین، ئاخر ئێمە بۆمان دەرکەوتووە هیچکەس وەک خۆمان ناتوانێت ئەم پارچە زەوییە و ئەم پارووە نانەمان بپارێزێت".

دەیگوت:

"کاکە خۆتان ببینن ئەم دەوڵەتی ئیسلامییە، ئەم ڕیشنانە، زێڕ و ئاڵتوونی ژنەکانمان بە ناوی یارمەتیدانی کەسانی بێدەرەتان دەبەن، پاشان دێن و دەیاندەن بەم ئاغایانە. دەیاندەن بە کوڕەکانی بارزانی بۆ ئەوەی بیکەنە خەرجی قیادەی موەقەتە و هەڵبکوتنە سەرمان. ئاخۆ ئیسلام وا دەڵێت؟ خودا وا دەڵێت؟ ئێوە بڕۆن ژیانی حەزرەتی محەممەد بخوێننەوە، بزانن قسەی وا دەکات؟!"

پیرەمێردێک دەی گوت:

"ئەم دەوڵەتە لە ڕژێمی پێشوو خراوترە. بە هیچ شێوەیەک ناکرێت متمانەی پێ بکەی. سبەی دو سبەی بۆی هەیە فڕۆکەمان بێنێتە سەر و بۆردومانمان بکات".

قسە و باسی شار ئەوەیە کە ناکرێت متمانەت بە دەوڵەت هەبێت، ناکرێت بڕوات بە ئیسلامی ئەمانە هەبێت، بۆی هەیە ئەمڕۆ نا سبەی بۆمبارانمان بکەن.

پێشمەرگەیەک دەیگوت:

"لە سەر عەرز کوردێک دەرەقەتی دە کەسی دوژمن دێت، بەڵام لە حەواوە... نازانم".

گوتم:

"دەوڵەت کاری وا ناکات".

گاڵتەی پێ کردم و گوتی:

"باسی چی دەکەی، بۆ لە نەغەدە وای نەکرد؟"

پیرەمێردێکی چاویلکە لە چاو لە تەنیشتمان ڕاوەستابوو چەکێکی بە دەستەوە بوو، دەستی لە سەر شانم دانا و گوتی:

"بنووسە ناوی من محەممەدە، ئەحمەد نییە".

لە هیچ تێنەگەیشتم، بەڵام بە قەڵافەتی ڕا دیار بوو تەمەنێک خەباتی کردووە، دیسان گوتی:

"سەیر نییە، ناوی من محەممەدە، لە دەفتەرەکەتدا بینووسە".

هاوڕێکانی دەوروبەری پیرەمێردەکە لە قاقای پێکەنینیاندا. ئەو بە پێکەنینەوە لە سەری ڕۆیشت:

"ئەحمەد ناوی ئەو موفتیزادە بەکرێگیراوەیە. ناوی من محەممەدە".
دواجار تێگەیشتم. پیرەمێردەکە ناوی ئەحمەد بوو، بەڵام پێی شوورەیی بوو لەگەڵ ئەحمەد موفتیزادە هاوناوە، بۆیە ڕۆژێک لە نێو کۆڕی هاوڕێیانیدا ڕایدەگەیەنێت:
"لە مرۆ بە دواوە ناوی من محەممەدە. ئەحمەد ناوی ئەو موفتیزادە بەکرێگیراوەیە".

**دەڵێن چوون بۆ گوند مەترسیدارە،**
**بەڵام من گوێی پێ نادەم و دەچم**

لە چەند کەسێکم پرسی چۆن دەکرێت سەر لە گوندەکان بدەم. هەموویان بە سەرسوورمانەوە گوتیان:
"ئێستا کەی کاتی چوونە گوندانە؟ مەترسیدارە".
لە پیاوێکی تەمەن دەوروبەری چل ساڵ دەپرسم:
"ئۆتۆمبێلەکانی گوند لە کوێن؟ بە کوێدا دەبێت بچم؟"

دڵسۆزانە دەڵێت:

"نازانم بۆچی دەتانەوێت بچن، بەڵام باشتر وایە نەچن".

هەموو گوتیان باشتر وایە نەچم، خەڵک ئێستا بێزارن، گومان لە هەر بێگانەیەک دەکەن. درێژەم بە ڕێگەکەم دا. لە شوێنێک بارهەڵگرێکی بچووک دە دوانزە کەسی سوار کردبوو. بێگومان دەچووە گوندێک. لە شۆفیرەکەم پرسی:

- دەچیتە کوێ؟
- دەچمە خاو.

نەمپرسی خاو لە کوێیە. لە پشت بارهەڵگرەکە، لە تەنیشت ئەوانی تر دانیشتم و کەوتینە ڕێ. بە حەپەسانەوە لە منیان دەڕوانی. لاوێک گوتی:

- دەتەوێ بچیتە کوێ؟
- نازانم.

بە ڕقەوە لێی ڕوانیم. یەکێکی تر پرسی: "لایەنگری خومەینیت؟"

تووڕە بوو. لە وەڵامدا پێکەنیم. گوتی:

"ئەگەر لایەنگری خومەینی بی، لەم شاخانە لەت و پەتت دەکەن. بگەڕێوە، پێویست ناکات بێی".

کەسی یەکەم بە قسە هات:

"بۆ ژارڕشاندن هاتووی. تۆ ساواکی خومەینیت. چیت لە گیانی ئێمە دەوێت؟"

تێ گیرابووم، بەڵام نەدەترسام. لاوێکی تەمەن حەڤدە هەژدە ساڵ کە ڕواڵەتی لە شوان دەچوو، گوتی:

"نابێت ساواکی خومەینی بێت. وێناچێت. دەبێت کۆمۆنیست بێت".

پاشان بە کوردی شتێکی بە کەسی یەکەم گوت. پێم وابێت گوتی منی لە لای پێشمەرگەکان لە بنکە بینیوە. کەسی یەکەم پێکەنی و گوتی:

"کۆمۆنیست قەی ناکات، کەس کاری پێت نەداوە، بەڵام ئەگەر بێت و بکەویتە چنگ پیاوانی قیادەی موەقەتە سمێڵت تاڵ تاڵ هەڵدەقەنن".

پێم خۆش بوو بکەومە چنگ پیاوانی قیادەی موەقەتە بۆ ئەوەی بزانم ئەوان چ دێوزمەیەکن، بەڵام دواتر چاوم بە قیادەییەکان کەوت و لە ناویاندا جگە لە خەڵکانی برسی، نەخوێندەوار و داردەست هیچی ترم نەبینی. ڕێبوارەکان هەڵوێستێکی نەرم و نیانتریان نواند. بە درێژایی ڕێ یەکە یەکە دادەبەزین و لە منیان دەپرسی تۆ دەتەوێت بچیتە کوێ و من وەڵامێکم پێ نەبوو. هەر ڕێبوارێک کە دادەبەزی دەبوایە بە نێو کێڵگەکانی گەنم و نۆکدا تێپەڕ بوایە، بە سەر چەند تەپۆڵکەیەکدا هەڵزنابا و تا شوێنێک ڕۆیشتبا کە بە دڵنیاییەوە کانییەک هەڵتۆقیوە، لەوێ دەگەیشتە چەند ماڵێکی بە خشت و گڵ دروستکراو کە دێهاتەکەی بوو. ئەم بارهەڵگرانە کە تەنیا ئامرازی هاتوچۆن، بە هەڵکەوت تێپەڕ دەبن و بە هەڵکەوت کەسێکی خەڵکی ئەم دێهاتانە لە سەر گردێکەوە دەیانبینێت، لەوێ ڕا هەڵدێت و هاوار دەکات بۆ ئەوەی شۆفیرەکە تێ بگەیەنێت کە بوەستێت و لە پشت بارهەڵگرەکەیەوە سواری بکات.

ئێستا سێ کەس لە پشت بارهەڵگرەکە ماونەتەوە. یەکیان دەڵێت:

- ئێمە ئەوە دەچینە خاو. تۆ لە خاو چ کارێکت هەس؟

- نازانم، هەروا دێم بۆ ئەوەی بیبینم.

سەری ڕاوەشاند.

بە جادەیەکی باریکی پڕ تەپوتۆز و پڕ تاسەدا تێپەڕ دەبین، گەنمەجاڕ و دروێنەی وەرزێرەکان لە پشت سەرمان بەجێ دێڵین، بە قەراغ کێڵگەکانی نۆک دا ڕەت دەبین، کە ژنانی کورد تێیاندا خەریکی دەسکەنەن، ڕانەمەڕ و کانی ئاو و تەپۆڵکەی بە داربەڕوو داپۆشراو تێدەپەڕێنین و دەگەینە خاو. گوندی خەڵکانێکی ستەملێکراو و ئازارچێشتو و کارکەر کە بە گشتی گەنم و نۆک دەچێنن و مەرداری دەکەن. لە سەردەمی شادا چەکەکانیان لە ژێر خاکدا حەشار داوە و لە ڕۆژانی شۆڕشدا چەک لە شان لە کێڵگەکان خەریکی دروێنەن. خەڵکانێک کە سنوورنشینن و سنوورەکانی خۆیان دەپارێزن. خەڵکانێک

که له دەوری یەک کۆبوونەتەوە و له داوێنی گردێکی نزیک سنووری عێراق، بیست ماڵی گچکەیان به خشت و قوڕ دروستکردووە، دوور له هەموو شتێک و له هەموو شوێنێک، بێ ئاو، بێ کارەبا، بێ قوتابخانە، بێ دکتۆر، ناویان لێ ناوە خاو و به هیوای کوردستانێکی ئاوەدان خەبات دەکەن.

به درێژایی ڕێگەکە، کاتێک ئەو سێ ڕێبوارە زانیان من به ڕاستی "ساواکی خومەینی" نیم و هەروەها کەس لێرەکانه ناناسم، بێجگه له وەش نازانم دەمەوێت چ بکەم، پێیان گوتم:

"ئێمه بۆ فاتیحا خوێندن دەچین بۆ خاو. کەسێکی خزممان مردووە. لێره ئۆتۆمبێل دەست ناکەوێت بۆ ئەوەی بگەڕێیتەوە. دەتەوێ چ بکەیت؟"

گوتم:

"منیش دێم بۆ فاتیحا دادان".

هەر سێکیان پێکەنین و بڕیاردرا لەگەڵیان بچم بۆ فاتیحادادان، کاتێک ئۆتۆمبێلەکه لەبەر دەرکی مزگەوت ڕایگرت، کۆمەڵێک پیاو

بەرەو پیرمان هاتن. پیاوێکی پیر بە فەقیانەی سپی و درێژ لە پێشەوەیان هەنگاوی دەنا. خەڵکی خاو بەخێرهاتنیان کردین، سێ کوردە ڕێبوارەکە سەرەخۆشیان لێکردن، منیش بە فارسی هاوخەمی خۆمم دەربڕی، کوردە ڕێبوارەکان دەستی پیرەمێردەکەیان ماچ کرد، منیش ئەو کارەم کرد. پاشان تێگەیشتم کە مەلای ئاواییە. بە ڕێزەوە ئێمەیان بردە مزگەوت، مزگەوتێکی ڕووت و قووت، چەشنی خاو. پیرەمێردەکە دوعای بۆ هەمووان و بۆ کوردستانیش کرد. گوتی با فاتیحا دادەین، هەموومان فاتیحامان دادا. چایان هێنا. پیرە پیاوەکە بە کوردی دەستی بە قسە کرد، هەموو گوێیان بۆ ڕاداشت. من تێ نەدەگەیشتم، سەیری ڕواڵەتەکانم دەکرد. ڕێبوارەکان منیان ترساندبوو، ئەمانە گشتیان کەسانێک بوون کە ئاشنای تەنگ و چەڵەمە بوون، ئارام و لە سەرەخۆ بوون، هەروەها کەسانێک بوون کە تەنانەت لە کاتی فاتیحادادان و نوێژکردنیشدا چەکیان لە تەنیشت خۆیان دادەنا. کە لە

قسەیان تێ ناگەیت و سەیریان دەکەی، لە بەر خۆتەوە دەڵێیت:

"ئەو کوردستانەی کە دەیانەوێت بە دەستی دێنن، بەس سەبر پێویستە. دەبێت لاوە خوێندەوارەکان شان بە شانی ئەم خەڵکە تێکۆشەرە ڕێ بکەن و پێیان بڵێن بۆچی سەرەڕای ئەوەی تا ئێستا شەڕیان کردووە، سەرنەکەوتوون. دەبێت تێیان بگەیەنن تەنیا چەک و شەڕ کردن تا دوا دڵۆپی خوێن نابێتە دەرمانی دەردان. دەبێت هۆشیار بن و بجەنگن. دەبێت بزانی ڕیشەی ئازارەکە لە کوێیە و ڕیشەکە بکرێتە ئامانج. دەبێت خەبات بکرێت، بەڵام هاوسەنگ و هاوتەریبی کوردەکانی دیکە و گەلانی تر".

غەریبە دەفکرێت:

"ئەمانە ئەو کوردستانەی دەیانەوێت پێی دەگەن. لە مێژ ساڵە تۆوی ئازادی و ئاوەدانییان وەک تۆوی گەنم و نۆک لە نێو خاکی کوردستاندا چاندوە و بە خوێنی لاوەکانیان ئاویان داوە، بەڵام دەبێت لاوە

خوێندەوارەکانیان بێن و فێریان بکەن بە یارمەتی کێ و لەگەڵ کام هاوپەیمان و کەی دەبێت دەست بدەنە داس و درووێنە بکەن".

# له سنه

ئەمڕۆ سێشەممەیە. ئیمام داوای لە هەموو چین و توێژەکانی خەڵک کردووە بەشداری ڕێپێوانی "یەکگرتوویی" بن و بە بەخیلان و دوژمنانی بسەلمێنن موسڵمانانی ئەم وڵاتە هێشتا یەکگرتوون و وەک شەیتانەکان دەڵێن هیچ کەلێنێک نەکەوتووەتە نێو ڕیزی یەکگرتووی موسڵمانانی ئێران.

ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن، پڕوپاگەندەیەکی زۆر بۆ بەڕێوەچوونی ئەم ڕێپێوانە دەکەن. من ئەمڕۆ لە سنەم، بە شەقامەکاندا پیاسە دەکەم بۆ ئەوەی بزانم خەڵک چۆن پێشوازی لەم ڕێپێوانە دەکەن یان چ بۆچوونێکیان هەیە.

لە سەر چوارڕیانی ناوەندی شار، پیاوێک خەریکە جگەرە دەکێشێت.

- کاکە ئەمڕۆ ڕێپێوانە؟
- پێم وانییە، نا، خۆتان باشتر دەزانن.

بە نێو شاردا دێم و دەچم، بارودۆخەکە ئاساییە. لاوێک کە وێدەچێت خوێندکار بێت، هەفتەنامەی "چەلەنگەر" دەفرۆشێت.

"ئەرێ ئەمڕۆ ڕێپێوان دەکرێت؟"

بە پێکەنینەوە دەڵێت:

"نا کاکە، لێرە هەموو کۆمۆنیستن".

کوڕێژگەیەک ڕۆژنامە دەفرۆشێت.

- ڕۆژنامەتان دەوێت؟
- کام ڕۆژنامە؟
- ڕۆژنامەی "ئایندەگان".

کاتژمێر دەی بەرەبەیانە. سەرم سووڕدەمێنێت. دەڵێم:

"ئایندەگان ئێستا لە تاران دەست ناکەوێت، چۆنە بە یەک - دوو سەعات گەیشتووەتە ئێرە؟"

کوڕەکە تەمەنی دە ساڵە، دەڵێت:

"ئێرە هەموو کۆمۆنیستن، ئایندەگان خێرا بە فڕۆکە دەی هێنن".

ڕۆژنامەیەکێ دەکڕم. کوڕەکە وەک ئەوەی پێم ڕابوێرێت، دەڵێت:

"ئەمنیش کۆمۆنیستم".

لە لاوێک کە چەقۆ و خەنجەربۆکس دەفرۆشێت، دەپرسم:

- ئەمڕۆ ڕێپێوان دەکرێت؟
- نا، لێرە باسی شتی وا لە گۆڕێ نییە.

لاوەکە دەڵێت:

"کە دەدوێت، سەروبنی قسەکانی باسی شیعەکانە، لە نووسینەوەی قانووندا باسی شیعەکان دەکات، سەرۆککۆمار شیعەیە، بەڵام کە دەبینێت دۆخەکە خراوە دەڵێت با هەموو

موسڵمانەکان بڕژێنە سەر شەقام. دەڵێت شیعە و سوننە بران. برایەتی ئەگەر ئاوا بێت کەس ڕێپێوان ناکات".

لە سەر ئەو کۆڵانەی ماڵی ئەحمەدی موفتیزادەی لێ هەڵکەوتووە، چوار - پێنج لاو لە دووکانێک دانیشتوون و خەریکی ڕۆژنامەخوێندنەوەن. دەپرسم:

"کوڕینە ئەمڕۆ خۆپیشاندان دەکرێت؟"

بێئاگا لە هەموو شتێک دەڵێن:

"ڕێپێوانی چی؟"

دەڵێم:

"ڕۆژنامەکان نووسیویانە، ڕادیۆ دەڵێت، هەر ئەو ڕێپێوانی یەککرتنە".

دەڵێن:

- قوم دەستووری ڕێپێوانەکەی داوە؟
- بەڵێ، پێم وابێت.
- دەی بارودۆخەکە دیارە. کەس ناچێتە ڕێپێوان.

دەپرسم:

"ماڵی موفتیزادە لە کوێیە؟"

به سەرسوورمانەوە دەپرسن:

- موفتیزادەت بۆ چییە؟
- هیچ. هەروا پرسیم.
- کاکە تکایە خەتێک بە سەر ئەم موفتیزادەیەدا بێنن، ئەم کابرایە گەورە مەکەنەوە، ئەو، کۆمەڵێک خەڵکی بێکەس و کاری وەک خۆی کۆکردووەتەوە و دامودەزگایەکی بۆ خۆی دروستکردووە. دەوڵەتیش پشتیوانی لەم لات و لووتانە دەکات. وازی لێ بێنن، چ کارتان بە موفتیزادە داوە.

به شێوازی قسەکردنیان گوشارم بۆ دێنن. ڕێگەکەم دەگۆڕم و بەرەو ئەو موسافیرخانەیە دەچمەوە کە لێی دەمێنمەوە.

**زانیاریی زیاترم سەبارەت بە مەریوان دەست دەکەوێت**

له سنە توانیم لەگەڵ کۆمەڵێک کەس ئاشنا بم و هەندێک زانیاری سەبارەت بە مەریوان بە دەست بێنم. زانیارییەک پەیوەندیی بە یەکێتیی جووتیارانەوە هەیە. ئێستا ئیتر گرفتێک چارەسەر بووە، ئیدی یەکێتیی جووتیاران

دەناسم و ئەمەش دواتر زۆر بە کەڵکم دێت. لەم بارەیەوە بە گشتی ئەم زانیارییانەی خوارەوەم دەست کەوت:

"بە هۆی بارودۆخی تایبەتیی کۆمەڵایەتی و ئابووریی مەریوان و لە بەر ئەوەی ئاغاکان لەوێ کاریگەرییەکی پتریان هەبوو، زوڵمێکی زیاتریان لە جووتیاران دەکرد، لەبەر ئەوەی هێشتا پرسگرێکی ئاغا و ڕەعیەت لە دێهاتەکانی مەریوان چارەسەر نەببوو، لەوە بترازێت ئاغاکان بەردەوام لەگەڵ یەکتری لە پەیوەندی دابوون و پێکەوە سیاسەتەکانیان دژ بە جووتیاران ڕێک دەخست، لە بەر ئەوەی خەڵکی مەریوان و دێهاتەکانی دەوروبەری لە پێش شۆڕشەوە دژ بە ئاغاکان، دەوڵەت، کۆمپانیاکانی کشتوکاڵ، شارەداری، فەرماندەری و ژەندەرمەری لە شەڕ دابوون، لەبەر ئەوەی سەرجەم ئەم دایەرانە بە ویستی دەوڵەت لە ژێر دەستی ئاغاکان دابوون و ئاغاکانیش بە هاوکاری ژەندەرمەکان و دەسەڵاتی سەربازخانەی مەریوان،

عــەرزە بــاش و بــە پیتەکانیان بۆ خۆیان هەڵگرتبوو، جووتیارەکانیان خستبووە سەر زەوییە بەردەڵان و بێ ئاوەکان، هەروەها لەبەر ئەوەی شاری مەریوان بە تەواوی لە کۆنترۆڵی ئاغاکان دابوو، ئەوان پاڵپشت بە دەسەڵات جادەکانیان بە تەنیشت مەزراکانیاندا لێ دەدا و ماڵی خەڵکیان دەڕووخاند و بە ناوی لێدانی جادە و دروستکردنی پارک و جوانکارییەوە چ بە لایەک پێیان خۆش بوایە بە سەر شار و گـونـدیـان دێـنـا، لـە بـەر گـەلـەک هـۆکـاری تریش کە دەبێت سەرەداوەکەیان لە دەستی ئیمپریالیزمدا بدۆزیتەوە، خەڵکی دێهاتەکان بۆیان دەرکەوتبوو، پێویست بوو یەک بگرن و بە سەرنجدان بە وەی ڕۆشنبیرانی کورد، ئەوانەی وازیان لە ژیانی تایبەتی و ئاسایشی تاکە کەسی هێناوە و لە دێهاتەکان ژمارەیان زۆرە و بـەردەوام جموجوڵی جووتیارەکان دەخـەنـە ژێر چاودێرییەوە، ئـەم ڕۆشنبیرە بەرپرسانە پەنجەیان لەسەر دەردەکە داناوە، وەڵامـی پێداویستییەکی حاشاهەڵنەگریان

داوەتەوە و لە سەردەمی محەممەد ڕەزا شادا بە شێوەیەکی نهێنی یەکێتییەکیان لە چەند گوندێکی مەریوان دامەزراندووە بۆ ئەوەی بەرەنگاری یەکێتیی ئاغاکان و ئەو ستەمە بێتەوە کە دەوڵەت دژ بە خەڵکی دێهاتەکان پەیڕەوی دەکات. هەڵبەت بەرەنگاریی ئەوکات لەبەر دێیەکی وێران و کاول بوو کە بە شاری مەریوانەوە لکابوو، ئاغاکان بە پاساوی جۆراوجۆر و بە پشتیوانیی هێزە ئەمنییەکان هەر جارە و بە شێوەیەک دەیانویست ئەم دێیە لە کۆڵ مەریوان بکەنەوە کە لە بەر ناحەزییان وەک پەڵەیەکی ڕەش وابوو. دیارە ئەو ئاغایانە مرخیان لەو پەڵە ڕەشە خۆش کردبوو، دەیانویست ئەوێ بۆ خۆیان هەڵگرنەوە، جادەیەک بە وێدا بکێشن و بە نرخی خوێنی چەپەڵی باوکیان بەو جووتیارانەی بفرۆشنەوە. دێهاتییەکانیش بە درێژایی ساڵێک سکاڵایان لەم دایەرە و لەو دایەرە تۆمار دەکرد و دەیانگوت دەردەکەیان ئەوەیە، زەوییەکانی خۆیانیان دەوێتەوە، برسی

ماونەتەوە و ئەمە ناهەقی و ستەمە و فڕی بە دادپەروەرییەوە نییە، دەیانگوت وەرن گوێ لە قسەمان بگرن، سەرێک لەم دێیە هەڵێنن و ئەم زەوییانە ببینن، پاشان خۆتان بڵێن ئاخۆ هەقی خۆمانە لەسەر ئەم زەویانە کار بکەین، یان نا. چ ئینسافە ژیانی ئێمە دەشێوێنن و ماڵەکانمان دەڕووخێنن؟ بە هۆی ئەوەی لە سەردەمی محەممەد ڕەزا شادا ڕەوا بوو ماڵی خەڵکی دێ بڕووخێنرێت، زەوییەکانیان لێ زەوت بکرێت، برسی بهێڵرێنەوە و کەس گوێ لە قسەیان نەگرێت، ئاغاکان دەستیان بە سەر زەوی و زاردا گرت، شاگەشکە بوون، دەستیان کردە مشت و پەلاماری زەحمەتکێشانیان دا، لە سەر زەوییەکانیان هەستان و دانیشتن و جووتەیان هاویشت.

بەڵام هاوکات کە ئەم ئاغایانە لە سەر زەوییەکان جووتەیان داویشت، ڕۆشنبیرەکان بە هانای خەڵکی دێهاتەکانەوە چوون، بە شێوەیەکی شاراوە، نوێنەری چەند گوندێکیان لە دەوری یەک کۆ کردەوە و سیاسەتێکی

تۆکمەیان دارِشــت، هێشتا ئاغاکان زمانی چەپەڵیان دژ بە دێهاتییەکان دەگەڕا، هێشتا مشتەکوڵەیان بە سەردا دەباراندن کە سەدان جووتیار بە پێمەڕە و گاسن و پاچەوە لە تەپۆڵکەکانەوە بـەرەو شار شۆڕ بوونەوە، ئەویش لە کاتێکدا لە بەر تاوانەکانی محەممەد ڕەزا شا نەتدەتوانی هەناسە بدەیت، هێشتا شۆڕش دەستی پێ نەکردبوو ئەوان دروشمیان دەدا "زەوی، زەوی"، هاواریان دەکرد ئەم پەڵە دزێوە، ئەم پەڵە شوومە سەرچاوەی ژیانی ئێمەیە و دەبێت هەبێت و ئێمە دەبێت لە سەر زەوییەکانی خۆمان بەم بێڵانە، بەم دەستانە، بـەم ژن و مـنداڵانـەی لـەگـەڵـمـانن، لەسەر زەوییەکانی خۆمان کار بکەین. لافاوی خەڵکی دێ شەقامە بەرتەسکەکانی مـەریوانـی پڕ کردبوو، ئەویش ڕێک لە کاتێکدا کە محەممەد ڕەزا شا پێیوابوو خـوای سـەر زەوییـە. لە شارێکی دوورەدەســـت و بنبەست، خەڵکی دێ توانیان عەرشی ئـەم خوایە بلەرزێنن، ژەندەرمەکان شڵەژان، تـەرازووەکـەی دادگا

لاسەنگ بوو. سوپا بە سامەوە لە خەو ڕاچەنی، شارەوانی وەک سەگێکی تێهەڵدراو دەیقروسکاند و لەجموجوڵی وەرزێرەکانی دەڕوانی. خەڵکی دێ بە ژن و منداڵەوە بە نێو شاردا سووڕانەوە و دروشمیان دا، لە کاتێکدا ئاغاکان هێشتا ئاگایان لە هیچ نەبوو، ئەمان هێرشیان کردە سەر ئەو زەوییانەی کە هی خۆیان بوون و ئارەقیان تێدا ڕشتبوون، ئینجا لە چاوترووکانێکدا ساواک، جاشەکان، پاسەوانەکان و سوپا بە تانک و تۆپەوە هاتن و لافاوی خوێن بەرپا بوو. جووتیاری تێکۆشەر بە داردەستی پاسەوانەکان مێشکیان پژا، بە گوللەی شەستیر پێکران، بەڵام هەر کە گاسنێک لە دەستی جووتیارێک بەردەبووەوە، ژنەکەی وەک گورگێک پڕی دەدایە و عەرزەکەی پێ دەکێڵا، هەر کە ژنە دێهاتییەک شەلاڵی خوێن دەبوو، کوڕەکەی کە ئاشنای دەرد بوو، وەک بێچووە گورگێک خۆی دەهاویشتە پشت گاسنەکە و بە سەر گاکاندا هاواری دەکرد "دەی، لە منت کەوێ، بیکێڵە"،

ئەو ڕۆژە ڕاپەڕینی جووتیارەکان خەڵتانی خوێن کرا، بەڵام یەکێتیی جووتیارانی مەریوان بە شێوەیەکی پتەو لە بن ئەو عەردانە سەری هەڵدا، کە بە خوێن ئاو درابوون".

دیارە ناڵێم ئەمە تەنیا هۆکاری دروستبوونی ئەم یەکێتییانە بوو، نا، ئەمە دەتوانێت یەکێک بێت لە هۆکارەکانی فۆڕم گرتنیان. با ئەوەش بڵێم کە ئەم یەکێتییانەی تایبەت بە جووتیاران لە مەریوان لە سەردەمی شۆڕشدا بەلەز تەشەنەیان سەند و گوندەکانی ناوچەکەیان گرتە بەر، جووتیاران لە ئاستی ناوچە کوردنشینەکاندا بوونە خاوەن دەسەڵاتێکی بەرچاو. وەک دواتر بینیمان ئەم هاوسۆزییە ئاکامی زۆر بەنرخی لێکەوتەوە. نموونەکەی ئەو ڕێپێوانەیە کە لە سنەوە بۆ مەریوان دەستی پێکرد و لە هەمووشیان گرنگتر کۆچی نارەزامەندانەی خەڵکی مەریوانە کە شاریان چۆڵکرد و پەنایان بۆ چیاکان برد. یان ڕاکشانی خەڵکی کامیاران لە بەردەم تانکەکانی سوپا کە هاتبوون دانیشتووانی مەریوان سەرکوت بکەن، ئەمانە هەموویان بە شێوەیەکی خورت و تۆکمە لە لایەن ئەم یەکێتییانەوە ڕێبەرایەتی دەکران.

خاڵێکی تری گرنگ کە لە دروستبوونی ئەم یەکێتییانەدا دێتە گۆڕێ، خۆتێهەڵقورتاندنی هێزە پێشکەوتنخواز و پەیمان پەرستەکان کە شان بە شانی جووتیاران هاتنە پێشێ و ئێستاش بە شێوەیەکی نهێنی لەگەڵیان لە پەیوەندی دان. لێرەدا پرسیارێک خۆ دەنوێنێت کە ئەمانە چ کەسانێکن؟

لەم بارەوە پرسیارم لە زۆر کەس کرد و سەرم لە زۆر شوێن دا بۆ ئەوەی هەندێک زانیاریم دەست بکەوێت. خەڵکی دێ، بە تایبەت منداڵە خوێندەوارەکانیان پێیان خۆشە تۆی بیانی تێ بگەیەنن کە ڕێکخراوێکی نهێنی پڕ لە ڕەمز و ڕاز هەیە و پێداگری دەکەی لەسەر ئەوەی زیاتر بزانیت، بۆت دەردەکەوێت ڕێکخراوێکی مارکسیستی - لێنینیستی بە ناوی سازمانی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان (کۆمەڵە) بە نهێنی لە ناوچەکە خەبات دەکات. ئەندامەکانی ئەو ڕێکخراوە بە جلوبەرگی جووتیارانەوە شان بە شانی خەڵکی دێ دەژین. ڕێکخراوەکە نووسینگە و

ئۆرگانی نییە، بەڵام بەیاننامەکانی لێرە و لەوێ بەدی دەکرێن. سەبارەت بەو ڕووداوانەی لە کوردستان دەقەومن، زۆر زوو شیکردنەوە دەدەن و شیکردنەوەکان دەگەنە دەست خەڵکی. کوردەکان بە شانازییەوە لەم ڕێکخراوە دەڕوانن و بە ئی خۆیانی دەزانن. بۆ نموونە لاوێکی کورد لە وانەیە لایەنگری ڕێکخراوی پارتیزانە فیداییەکانی گەل بێت و سۆزی بۆ سازمانی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان هەبێت کە زیاتر ڕواڵەتێکی نەتەوەیی و ناسیۆنالیستی هەیە. یان کەسێکی خەڵکی لادێ کە لە دەوروبەری مەهاباد دەژی، چەندەش بە شێوەیەکی نەریتخواز دیموکراتی بێت، سازمانی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانیشی خۆش دەوێت، بەڵام کاتێک دەپرسی بۆچی ئەم ڕێکخراوە خۆی ئاشکرا ناکات، لە وەڵامدا ئیستێک دەکەن و دەڵێن "بەدڵنیاییەوە بە چاکی نازانێت". کاتێک دەپرسی "دەبێت چ هۆکارێک هەبێت کە ڕێکخراوەکە بە ئاشکرا ڕاناگەیەنن؟" وەڵامی وات دەدەنەوە کە

به هیچ شێوەیەک قایلت ناکەن. کە زیاتر لە کوردستان دەمێنیتەوە و لەم و لەو دەپرسی، دواجار لە دڵی خۆتدا وای بۆ دەچی کە ئەم ڕێکخراوە بە گوێرەی پێویست پێی هەڵنەگرتوە و دەسەڵاتی نییە، بەڵام سەبارەت بە ڕووڕاست بوونیان و بە دواداچوونیان بۆ ئیشەکان و ئەو پشتیوانییەی خەڵک لە وانی دەکات، گومانت لا دروست نابێت.

هەرچی بێت خەڵکی ناوچەکە پێیان خۆشە بڵێن ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە لە دامەزراندنی ئەم یەکێتییانەدا دەستیان هەبووە. لە لاپەڕەکانی پێشوودا زیاتر لەگەڵ ئەم ڕێکخراوە ئاشنا دەبین.

### سەکردن لەگەڵ ئەندامێکی حیزبی دیموکرات

لە سنە سەرم لە نووسینگەی حیزبی دیموکرات دا و لەوێ لە تەک یەکێک لە بەرپرسان گفتوگۆمان کرد کە دەکرێت بڵێین هەمەکارە بوو. زۆرمان لە بارەی کوردستانەوە قسە کرد، هەم نەریتی خۆی هێنایە زمان و

هەم ئی حیزبەکەی، بەڵام بڕیاردرا من تەنیا بەشێک لە قسەکانی ببیستم و بەشێکی تری بە گوێمدا نەچێت. بەشێک لە قسەکانی بەم جۆرە بوو:

«ئێمە لە چوارچێوەی ئێراندا خودموختاریمان گەرەکە.

سیاسەتی زاڵ، دژ بە گەلی کورد پڕوپاگەندە بەڕێوە دەبات و بە جیاخوازمان لەقەڵەم دەدا، ئێمە هیواداریین ئەم کەشوهەوایە لە گۆڕێ نەمێنێت.

ئێمە دان بە شتێک دانانێین بە ناوی یەکێتیی جووتیارانی کوردستان.

دەوڵەت ناتوانێت لە ڕێگەی ئاسمانییەوە ئێمە سەرکوت بکات، یانی وەها کارێک ناکات.

خەبات درێژەی هەیە، بەڵام ئێستا ناتوانین بۆچوون بدەین چۆن و بە چ شێوەیەک خەبات دەکەین. لە وانەیە پێویست بکات شێوازێکی توندوتیژتر بگرینە بەر، وەلێ بە دڵنیاییەوە ئێمە دەستپێشخەری ئەو شێوازە نابین. ئێمە تەنیا خۆمان دەپارێزین و ئەگەر ناچاربین وەڵام دەدەینەوە.

ناکرێت متمانە بە دەوڵەتی ئێستا بکرێت.

ئێمە ڕۆژ بە ڕۆژ بێ هیواتر دەبین.

خاڵی گرنگ ئەوەیە کە ئێمە سوننەین و بڕوامان بە ئیمام نییە، کەواتە بەشداری پیاوە ئاینییەکان لە نێو دەوڵەتدا، گرفتمان بۆ دروست دەکات.

ئێمە لە بنەڕەتدا بڕوامان بە لاوازکردنی دەوڵەت نییە.

موفتیزادە کەموکوڕی زۆرن و ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی خەڵک ڕووی لێ وەرگێڕێت.

شێخ عیزەدین حوسێنی تەنیا پیاوێکی ئایینی و پێشنوێژی مەهابادە، ئاخۆ کەسایەتییەکی ئایینی دەتوانێت ڕێبەرایەتی ناوچەیەک بە دەستەوە بگرێت؟ ئێمە بەس وەک پیاوێکی ئایینی ڕێزی لێ دەگرین.

فیداییەکان؟ نازانین، ئێمە لێرە شتێکمان نییە بە ناوی پارتیزانە فیداییەکان و پەیوەندیشمان بە ڕێکخراوەکەی ئەوانەوە نییە.

ئەها، ئەوەی ئێوە باسی دەکەن، ئێمە حاڵی حازر لە مەهاباد، نەک لێرە، چاوپۆشی لە چالاکیی لایەنگرانیان دەکەین.[2]

دەرەبەگایەتی بەو شێوەیە لە کوردستان بەدی ناکرێت.

جووتیارانی کوردستان زۆرتریان ستەم لێ کراوە، هەم لە ڕوانگەی فەرهەنگی و هەم لە ڕوانگەی ئابوورییەوە. سیستمی کشتوکاڵی ئێرە، سیستمی چاخی ناوینە.

حیزبی دیموکرات لە بەشی باکووری کوردستان کاریگەریی هەیە، لە سەدا نەوەدی خەڵکی ئەوێ پابەندی حیزبن.

قیادەی موەقەت؟ بە داخەوە مەسەلەیەکی ئاڵۆزە. ئەوان برای ئێمەن، ئەوان پەنابەرن، زوڵمیان لێ کراوە، ستەمیان چێشتووە و ئێمە بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ ئەوە نین دەست لە کاروباری کوردستاندا وەربدەن، ئەوان میوانی ئێمەن".

[2] یەکێک لەو قسانەی کە دەبوایە چاوپۆشی لێ بکەم (دیارە ئەمەیان گوتنی لە نەگوتنی باشترە) ئەمە بوو:
ئەو بەرپرسە گوتی فیداییەکان تەنیا کارێکی باش کە دەیکەن و شیاوی پەسندی ئێمەیە و بەکەڵکمان دێت، بڵاوکراوەکەیانە کە لە کاتی خۆیدا دەیگەیەننە دەست خەڵکی، بڵاوکراوەیەکی زۆر ڕێکوپێکە...

## قیادە موەقەتییەکان کێن؟

قیادە موەقەتییەکان هێدی هێدی دێنە بەر چرا. مەریوانییەکان بە بەکرێگیراوی دەوڵەتی ئێستایان دەزانن وەک چۆن پێیان وایە پێشتر بەکرێگیراوی دەوڵەتی شا بوون، حیزبی دیموکرات بە میوانیان لە قەڵەم دەدات. دەوڵەتیش هەمان سیفەتیان دەداتە پاڵ. باشە ئەم قیادە موەقەتییانە کێن؟

هەڵبەت پێویستە بگوترێت هەموو ئەم یارییانە بە فیتی ئیمپریالیزم و بە تایبەتیش ئیمپریالیزمی ئەمریکا دەکرێن. ساڵی 1980 کە دۆخی ئابووری و ڕامیاریی دەوڵەتی عێراق خراپ بوو، ئەمریکا، بە پەی بردن بەو دۆخە ئاڵۆزە، بە یارمەتیی سوپای شاهەنشا کە لە ژێر دەسەڵاتی خۆی دابوو، لە نێوان عێراق و ئێراندا شەڕی هەڵگیرساند. شا وەک داردەستی ئەمریکا پشتیوانی لە مەلا مستەفا بارزانی دەکات کە وەک تۆپێک کەوتووەتە بەر پێی ئەمریکا، شا دژ بە دەوڵەتی عێراق هانیان دەدا بۆ ئەوەی بەرەی یەکێتی ولاتانی عەرەب دژ بە ئیسرائیل لاواز بکات. دواجار ئەمریکا ساڵی 1975 دەوڵەتی عێراق ناچار دەکات لەگەڵ دەوڵەتی ئێران بەڵێننامەیەک واژۆ بکات کە ویست و داواکارییەکانی ئێران واتە هەمان داواکارییەکانی ئەمریکا جێبەجێ بکرێن، ئەم بەڵێننامەیە لە لایەن شا و سەدام حوسێنەوە لە جەزائیر واژۆ دەکرێت. دەرئەنجامی یەکەم، ماڵوێرانی کوردەکانە. بەم جۆرە، خیانەتێکی

تری مەلا مستەفا بارزانی ئاشکرا دەبێت. مەلا مستەفا بە پشتیوانی شا دێتە عەزیمییەی کەرەج و سەدان هەزار ئاوارەی کورد لە شوێنە دووردەستەکانی ئێران و دوور لە کوردستان جێگیر دەکرێن.

بەڵگەنامەی خیانەتەکانی بارزانی لە هەموو شوێنێک دەستاودەست دەگەڕێت، لە نێو دەستی پیاوە سیاسییەکانی ئەمریکادا وەک هەوێری پەیکەرسازی وابووە. جارێک کردوویانەتە گۆپاڵ و بە قازانجی ئیسرائیل دژ بە عەرەبەکان بە کاریان هێناوە و جارێکیش بە قازانجی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و بە پشتیوانی شا دژ بە کوردانی ئێران بە کاریان هێناوە. ئەوسا بۆ لە سەرپێ مانەوەی دەوڵەتی سەدام حوسێن خەباتگێڕە عێراقییەکانیان پێ سەرکوت کردووە، سەردەمانێکیش گۆپاڵەکەیان داوەتە دەست خۆی بۆ ئەوەی تا لە توانای دایە خۆی و گەلەکەی پێ سەرکوت بکات. بارزانی هاوکاری "ساواک" دەکات، نۆکەری "میت"ی تورکیایە، گوێڕایەڵی

موسادی ئیسرائیله و دواجار قورسترین زەبر له پیاوەکانی خۆی دەدات، ئاوارە و پەڕیوەیان دەکات، خۆی و بنەماڵەکەی دێنه عەزیمییەی کـەرەج و پیاوەکانی لـه کوێرەدێیەکان به بنێشت فرۆشتن و حەمباڵی و برسێتی بژیوی ژیانیان دابین دەکەن. تا ئەو کاتانەی خەڵک له ئێران هەستانه سەر پێ و ڕاپەڕین، دەسـەڵاتی محەممەد ڕەزا شا مانگانه مووچەی دەدا به کوردانی پەنابەر، لەگەڵ شۆڕشی خەڵکی ئێران، ئەم مووچەیه نامێنێت، کاریش ئیتر دەسـت نـاکـەوێت، خەڵکی پەنـابـەری کـورد هەرچۆنێک بێت به برسێتی ژیان دەگوزەرێنن. هـاوکـات کـوڕەکـانی بـارزانـی (مـەسعـوود و ئیدریس) به دەستووری ئاغاکانیان خۆیان ئامادە دەکەن پاش مردنی باوکیان درێژە به تاوانەکانی بدەن و ببنه داردەستی ئیمپریالیزم. بۆیه به ویستی ئەرباب شتێک به ناوی قیادەی مـوەقـەت دروسـت دەکـرێت. شـۆڕش وەک دەبینین، ناتەواو دەمێنێتەوە، کوردەکانی ئێران کوڵ نادەن، درێژە به شۆڕش دەدەن و باس له

خودموختاری و مافەکانیان دەکەن. دەوڵەتی قوم کە ناوەڕۆکەکەی ڕوون و ئاشکرایە و گوێڕایەڵبوونی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەکەوێتە بەر چاو و پیاوانی سەر بە ئیمپریالیزمی ئەمریکا وەک مانگای قەشان لە نێو ئەندامانیدا دەبینرێت، بەربووەتە گیانی گەلی کورد و هەوڵ دەدات بەرژەوەندییەکانی ئەرباب کە هێشتنەوەی کوردستانە (کوردستانی ئێران - عێراق - تورکیا - سوریا) بە دواکەوتوویی، وەک خۆیان بپارێزێت. لە بەر ئەوەش دەنگی ئازادیخوازی لە ناوچەکە دەخنکێنێت. خەڵکی برسی تر بە ناوی سوپای پاسداران لە تاران و قوم و شوێنەکانی دیکەوە دەنێرێتە سەر کوردەکان، ژاندەرمەکان دەنێرێتە ناوچە بۆ ئەوەی هەر کەس هەناسەی دا لە ژێر پۆستاڵەکانیاندا پانی بکەنەوە، بەڵام خەڵک خۆڕاگری دەکەن و دەڵێن ئەگەر تەنانەت خوداش لە ئاسمانەوە بێتە خوارێ، ئێمە ئیتر ژاندەرممان ناوێت، دەوڵەت پێداگری دەکات و گەل کوڵ نادات. دەوڵەت پەلامار دێنێت و

کورد بە توندی بەرپەرچی دەداتەوە. دەوڵەت بە پاسدارەکانییەوە پاشەکشە دەکات.

دەوڵـــەت بـەس لـە فـیکری ئـەوە دایـە ناوەندەکانی دەسـەڵات لە کوردستان بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. دەیەوێت سەرجەم بنکەکان دیسان پڕبکاتەوە لـە ژەنـدەرمـە، کوردەکان وە زاڵە دێن، دەوڵەت دەکشێتەوە، دیـســان پـاســداران دەنـێـرێـت، کـوردەکـان هاواریان لێ بەرزدەبێتەوە و دەڵێن:

"سەیر پێوە بووین، چما خۆمان ناتوانین شارەکەمان بەڕێوەبەرین ئێوە لە تارانەوە پاسدارمان بۆ دەنێرن. ئێمە خۆمان لاوەکانمان ئەرکدار دەکەین شارەکان و سنوورەکانمان بپارێزن، مەگەر ئێمە ئێرانی نین، بە قامان نییە".

بەڵام ئیمپریالیزم نایەوێت گەلی کورد چەک هەڵگرێت، نایەوێت خۆی سەرەدەر لە کارەکەی خۆی دەربکات، پێویستی بەوەیە کوردستان پاشڤەڕۆ بمێنێتەوە بۆ ئەوەی بە ئاسانی بتوانێت بارزانییەکان جێگیر بکات. جا لە بەر ئەوەی

ئیمپریالیزم ئێستا نایەوێت، دەستوور بە دار و دەستەکەی لە نێو دەوڵەت دەدا کە "دەبێت بە هەر شێوەیەک بووە، چەک لە دەست گەلی کورد دەربهێنرێت، چما دەکرێت کوردی ئێران چەک بە دەست بن؟ سبەی نۆرەی کوردەکانی عێراقە و پاشان کوردەکانی تورکیا و ئینجا کوردانی سووریا و..."

دەوڵەتیش دەستوبرد دەکات و بە گەلی کورد دەڵێت:

"زۆر باشە، بۆ ئێوە ناتانەوێت پاسدارەکان لە خۆتان بن، ئێمەش قبووڵمانە".

دەوڵەت سەرجەم ناوچە کوردنشینەکان (لە سنەوە تا ئەوبەری ورمێ) دەکاتە سێ بەش، لە چاوتروکانێکدا سێ بوونەوەری سەیروسەمەرە لە کیسەی ئیمپریالیزم دێنێتە دەر، کەسی یەکەم مرۆڤێکی بێبەختە بە ناوی موفتیزادە کە گەلی کورد بە گشتی ڕقیان لێیەتی. ئەو زاتە کە دەوڵەت پێی دەڵێت عەللامە، نزیکەی حەوسەت هەشت سەد کەسی بێچارە، برسی، بێکار، چەقۆکێش و

لات و لووتی لە دەوری خۆی کۆ کردووەتەوە و مانگانە حەوسەت هەشت سەد تا هەزار تمەنێکیان پێ دەدا و بە ناوی پشتیوانی لە کۆماری ئیسلامی لە سنە تا سەردەشتیان دەخاتە بەر دەست بۆ ئەوەی چاویان بە سەریەوە بێت و گەلی کورد بچەوسێننەوە.

بوونەوەری دووەم شتێکە بە ناوی قیادەی موەقەت کە باسمان کرد چۆن دروست بووە، ئیمپریالیزم پێی باشە دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی لەگەڵ ڕێبەرانی قیادەی موەقەت کە کوڕە خۆفرۆشەکانی بارزانین، دانوستان بکات و جارێکی دیکە وەک داردەست بۆ سەرکوتی ئازادیخوازان بەکاریان بێنێت. دانوستانەکان دەگەنە ئاکام و ئیدریس و مەسعوود بارزانی پەنابەری ڕووت و ڕەجاڵ کۆ دەکەنەوە، ڕووی بێ پارەیی ڕەش بێت، چونکە بە پارەیەکی زۆر کەم ڕەوانەی کوردستانیان دەکەن بۆ ئەوەی سەردەشت تا پیرانشار بپارێزن، گەلی کورد شێت دەبێت، بەڵام دەوڵەت وەڵام دەداتەوە:

"ئیتر چیتان دەوێت، ئەمانە جلی کوردی لە بەر دەکەن، بە کوردیش دەدوێن، خۆ ئەمانەمان لە تارانەوە نەناردووە، برای خۆتانن".

کوردی عێراقی پەنابەری برسی دەبێتەوە بە دەسکەلا، بەڵام ئەم جارە دەسکەلای کەسانێک کە دەیانەوێت حکومەتی عەلی پیادە بکەن.

دەمێنێتەوە لە پیرانشار بەرەو سەرێ (باکووری کوردستان، بە پێی نەخشەی ئیستیعماری بریتییە لە شارەکانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، واتە بەشێک لە ورمێ، دێهاتەکانی دەوروبەری خۆی، شاپوور، ناوچەی برادۆست و ...)

ئێرە بە ئەستۆی بوونەوەرێکی سەیر و سەمەرەی ترە بە ناوی حەسەنی، یان مەلا حەسەنی یاخود ئایەتوڵلا حەسەنی، سەرۆکی کۆمیتەکانی ورمێ. پیاوەکانی ئەم مەلا پاشڤەڕۆیە لە شارگەلی نەغەدە، پیرانشار، سەردەشت و بە تایبەتی لە بنکەی جلْدیان لە هەموو شوێنێک شان بە شانی قیادەی موەقەت دەبینرێن.

بەم جۆرە، ئیمپریالیزم نەخشەی خنکاندنی گەلی کورد پیادە دەکات. ئێستا ئیتر شارەزای قیادەی موەقەتیش بووین. ئەمانە بە کرێگیراوی ئیمپریالیزمن و دەوڵەت هەوڵ دەدات گەلی کورد تێ بگەیەنێت کە برا و میوانیانن، دیارە خەرجەکەشیان لە خەزێنەی گشتی دەدرێت، یان بە دەردی ئەو کوردە مەریوانییە لە زێڕی ژنان کە براوەتە قوم.

**خەڵک دەڵێن بانەیان بۆردومان کردووە بەڵام مەسەلەی سەرەکی شتێکی دیکەیە**

سەعات دەوروبەری ٦ی پاشنیوەڕۆ، لە کاتێکدا لە موسافیرخانە لەسەر پشت ڕاکشابووم و ڕۆژنامەم دەخوێندەوە، لە پەنجەرەی کراوەوە، گوێم لێ بوو بڵیندگۆیەک لە شەقامەکەدا هەندێک شتی بە کوردی گوت، بە گشتی تێگەیشتم کە دەڵێت:

"مەردم سنە، بە هانای خەڵکی بانەوە بچن".

لە سەر قەرەوێڵەکەم ڕاچەنیم و خۆم گەیاندە خاوەنی موسافیرخانە.

- حاجی ئاغا چ باسە؟
- نازانم کاکە گیان، بانەیان بۆردومان کردووە.

پرم دایە جانتاکەم و هەڵتەک هەڵتەک بەرەو پاسەکانی سەقز چووم تاوەکوو لەوێوە بچمە بانە.

ڕقم لەم کارەی خۆم بوو، پێم خۆش نەبوو بە دوای ڕووداوەکان بکەوم، بەڵام نەمدەتوانی هیچ شتێکی تر بکەم، هەوڵم دا ئەم هەڵسوکەوتەی خۆم پشتگوێ بخەم و نەیخەمە خانەی سەر بە گۆبەند. سواری پاس دەبم و دەکەوینە ڕێ، لە ڕیزی پێشەوە، پیرەپیاوێکی کورد دانیشتووە.

- باوکە لە بانە چ ڕووی داوە؟
- بۆمبارانیان کردووە.
- کێ بۆمبارانی کردووە، بۆچی بۆمبارانیان کردووە؟

بە تووڕەییەوە ئێژێ:

"خومەینی، خومەینی، خومەینی بۆردومانی کردووە. ئەو موسڵمانانی ناوێت، جوولەکەی دەوێتن، ئەرمەنی دەوێتن، موسڵمانی ناوێن،

دەڵێت سوننە موسڵمان نین، شیعە موسڵمانن، شیعە و بەس".
ئێستێک دەگرێت و دواتر دەڵێت:
"دونیا دەوران دەورانـە. گۆپاڵەکە ئێستا بە دەست ئەوانەوەیە، دونیا دەسوورێت و گۆپاڵەکەش دەسوورێت. تا ئێستا بە دەستی فارسانەوە بووە".
نـەفـرەت لـە ئـەمریکا بـۆ ئـەو بـەزمـەی دروسـتـی کــردووە. کـورد، فــارس، شیعە، سوننە. ئەم پیاوە چ ڕقێکی هەڵگرتووە، چەند چـاوەڕوانـە بـۆ ئـەوەی گۆپاڵەکە بکەوێتە دەستی. هەموویان بەپەرۆشن، کەس نازانێت چ ڕووی داوە. ڕادیۆی کوردستان چەند جار داوای یارمەتی کردووە.
چەند لاوێکی کورد کە بە قەڵافەتیان ڕا دیارە خوێندەوارن، دەیانەوێت زیاتر بزانن. پەیتا پەیتا پرسیار لە موسافیرەکان دەکەن. یەکێک دەڵێت:
"بۆمب نەبووە. ئاڵغامی دژە تانک بووە. ٢٠٠ کوژراو و بریندار هەن و لە وانەیە بە ئەنقەست نەبووبێت".

ڕێبوارەکان بێ ئەوەی لە بابەتەکە تێ بگەن، یەکسەر دەست دەکەن بە جنێودان و دەڵێن:

"بە ئەنقەست بووە. لە قومەوە دەستوور هاتووە، بە ئەنقەست بووە".

هەموویان تووڕەن، حوکم دەردەکرێت، لە قومەوە دەستوور دراوە. من پێش بە خۆم دەگرم بۆ ئەوەی دادوەری نەکەم. کەش و هەواکە گوشار دێنێت، هۆکارێکم پێ شک نایە، بەڵام ئەوان پێویستیان بە هۆکار نییە، بریندارن. هۆکاری بێزاریان لە قوم ئاشکرایە. هەر کە دەتەوێت بڵێیت چۆن بەو بڕوایە گەیشتی، یەکسەر وەڵام دەدەنەوە بۆ جەژنی خوێناوی سنەتان فەرامۆش کردووە؟ چما نەغەدەتان لە بیر چووەتەوە؟ غەریبەش، چونکە زۆری لێ نازانێت دەمی دادەخات و کپ دەبێت.

ئەمڕۆ ئیتر مەحاڵە بزانی لە بانە چ ڕووی داوە، چونکە تا دەگەینە سەقز، درەنگ دەبێت و ئۆتۆمبێلێک نامێنێتەوە

بتبا بۆ بانە، سبەی هەموو شتێک جێبەجێ دەبێت. پاسەکە سەعاتێک دەبێت کەوتووەتە ڕێ. من لە ڕێزی پشتەوە دانیشتووم، چوار لاوی کورد لە ڕیزەکەی من دانیشتوون. پاش ماوەیەک بە خۆمم گوت بێکار دانیشتن و ڕۆژنامە خوێندنەوە چ سوودێکی نییە، باشتر وایە لەگەڵ کەسانی تەنیشتم قسە بکەم، ئەوان دەتوانن کوردستانم باشتر پێ بناسێنن. سیلەی چاوێکم تێ گرتن، چوار لاوی تاوەسووت بوون، هەستم کرد خەڵکی دێهاتن، بە دڵنیاییەوە خوێندەواریشیان نەبوو، فارسیشیان نەدەزانی، چونکە دوو سێ جار هەندێک شت هاتە پێش کە بە کوردی قسەیان لەگەڵ کردم. لە کورسیی پێشەوە، کوڕێکی دە دوازدە ساڵان دانیشتبوو، بە خۆمم گوت ئەمانە دەبێت چییان پێ بێ بۆ ئەوەی پێم بڵێن، یان قسەکانیان چ دەردێکی من دەرمان دەکات. گەیشتینە دیواندەرە، نیوەی ڕێمان بڕیبوو، یەکێک لەو چوار گەنجانە لە پاسەکە دابەزی، شتێکی کڕی و گەڕایەوە.

ڕۆژنامەکەم هێنایە دەر و لە ژێر شۆقی کزی گڵۆپی پاسەکە درێژەم بە خوێندنەوە دا. ئیتر ئاگام لێیان نەما تا ئەو کاتەی لاوێکی تەنیشتم بە کوردی بانگی کردم، لەگەڵم دوا و مشتێک سێوی ورد و چرچی بۆ ڕاداشتم و گوتی "فەرموون بخۆن".

چاوێکم لەو کرد و چاوێک لە سێوەکان، ئینجا نۆڕیمە گەنجەکانی تر کە بە تامەزرۆییەوە قەپاڵیان لە سێوەکان دەگرت، دەستم گرتەوە و ئەویش سێوەکانی خستە نێو مشتمەوە. وەک ئەوان، بێ ئەوەی سەرنج بدەم چ دەخۆم، یەکە یەکە قەپاڵم لە سێوەکان گرت. ئەو کوڕەی لە پێشەوەشمان دانیشتبوو سێوی دەخوارد، سێوەکان بوونە بیانوویەک بۆ ئەوەی سەری قسەیان لەگەڵ بکەمەوە.

"فارسی بەلەدی؟"

پێکەنی، ئاماژەی بە کوڕێژگەکە کرد و شتێکی پێ گوت. کوڕەکە لە سەر قاچەکانی دانیشت و پێی گوتم دەڵێم چی. دەیویست وەرگێڕان بکات، گوتم ئاخۆ فارسی دەزانێت؟

کوڕە تەرجەمەی کردەوە و وەڵامی وەرگرتەوە، بەڵام وەڵامێکی تۆکمە:

"تۆ کوردی دەزانی؟ من فارسی نازانم و پێویستیشم پێی نییە".

کەمێک خۆم کۆکردەوە، ئەمجارەیان ئەو پرسیاری کرد و کوڕەکە بۆی وەرگێڕام:

"تۆ لە کوردستان چ دەکەی؟"

گوتم:

"بۆ سەفەر هاتووم، دەمەوێت کوردستان ببینم، بیناسم".

وەڵام درایەوە:

"وێژەی کوردی دەناسی؟ دەتەوێت بیناسی؟"

بە هەڵەدا چووبووم، بێگومان ئەوان کۆمەڵێک لاوی نەخوێندەواری دێهاتی نەبوون، بەڵکە کۆمەڵێک لاوی دێهاتی بوون کە بە دڵنیاییەوە زۆر کاریان کردبوو، گەلێ شتیان بۆ گوتن پێ بوو، مایەی گاڵتەجاڕی بوو کە پێم وابوو چونکە فارسی نازانن نەخوێندەوارن، بۆچی دەبێت نەخوێندەوار بن، بێگومان ئەو بە

کوردی خوێندویەتی، بە کوردی دەنووسێت، بە کوردی دەخوێنێتەوە، ئەدەبیاتی کوردی دەناسێت. ئەمە کارەساتێکە تووشی گەلی کوردیان کردووە، گەلی کورد نابێت بە کوردی بدوێت، نابێت بە کوردی بنووسێت، ئەگەر کوردێک کتێبێکی لێ بگیرێت دەخرێتە سیاچاڵەوە، کوردێک ئەگەر فارسی نەزانێت شاخاوییە، هۆڤە، منیش تاوێک لە مەوپێش بە هەمان تێڕوانینەوە لە لاوەکەی تەنیشتمم ڕوانیبوو.

وەڵامم دایەوە:

"نەخێر، شارەزای ئەدەبیاتی کوردی نیم".

بە دەم پێکەنینەوە شتێکی بە کوڕەکە گوت و کوڕەکەش بە پێکەنینێکی خوڕتر قسەکانی بۆ وەرگێڕام:

"من بازرگانم، بازرگانی وێژەی کوردی، بازرگانی سیاسەتی کوردی، بازرگانێک کە دەیەوێت شان بە شانی خەباتگێڕانی تر، کوردەکان ڕزگار بکات. کوردەکانی ئێران، عێراق، تورکیا و سووریا هەموویان یەکن و

ئەمیان بۆ ئەوی تر واتایەکی نییە، هێڵێکی دەسکرد بە ناوی سنوور ناتوانێت کوردەکان دابەش بکات. من بازرگانێکم و بڕوام بە شتێک بە ناوی سنوور نییە".

پرسیم:

"بە چۆن بازرگانییەک کوردەکان ڕزگار دەکات؟"

لاوە کوردە هەژدە ساڵەکە ئاماژەیەکی بە تەلیسێکی بن کوشنەکەی کرد و یەک دوو قسەی کرد. من پێشتر تەلیسەکەم بینیبوو پێم وابوو خەیاری کڕیوون و دەیانباتەوە گوند، بەڵام کاتێک قسەکانی وەرگێڕدران، دەرکەوت تەلیسەکە شتی تری تێ دایە.

"ئەگەر سەیری ئەم تەلیسە بکەن، پێتان وایە چی تێ دایە؟ ها؟ با پێت بڵێم. کتێب و فیشەک، کتێبی کوردی و فیشەکی دە ڕووسان. کوردی تورکیا و عێراق دیلن، لە ژێر گوشار دان، ئێستا کە من لە چاو ئەوان سەربەستم، کتێبی سیاسی، ئەو کتێبانەی چارەی دەردیان تێدا نووسراوە، لە سەرانسەری کوردستان، لە کۆڕ و کۆمەڵە

نهێنییەکان و لە هاوڕێیانی خەباتگێڕ وەردەگرم، دەیانخەمە نێو ئەم تەلیسەوە و دەیانبەمە گوند، گوندی "زەڵێ"، ڕێک سەر سنوور. کە شەو داهات وەک ڕێوییەک کتێبەکان بە کۆڵم دادەدەم، فیشەکەکان لە نێوقەدم دەهاڵێنم و بە تاریکی، خاکی عێراق دەبەزێنم. هاوڕێیانی خەباتگێڕ لەوێ لە بنکەی شاراوە چاوەڕێمن. منداڵانی کورد لەوێ تینووی پەروەردەن. باوکانی ئێمە تا ڕۆژی ئەمڕۆ شەڕیان کردووە، شەڕێکی زۆر بە زانستێکی کەمەوە، بەڵام ئێمەی لاوانی کوردستانی ئێران، کوردستانی عێراق و کوردستانی تورکیا دەست دەخەینە ناو دەستی یەکترییی و بە شەڕی پێداگر و زانستی پێداگرترەوە خەبات دەکەین، لەودیوی سنوور لاوانی کوردی عێراقی چاوەڕێمن کتێب و فیشەکەکانیان پێ بدەم، ئینجا شەوی داهاتوو بگەڕێمەوە ماڵێ و ڕۆژەکەی تر، بە دووی کتێب و فیشەکی تازەدا بست بە بست خاکی کوردستانی ئێران تەی بکەم. من بازرگانێکم دەتوانم کتێب و فیشەک بە نرخێکی هەرزان

بکڕم و بە هەرزانتریش بیفرۆشمەوە، بە پێچەوانەی سەرجەم بازرگانەکانی دونیا".

کوڕە وەرگێڕەکە ئیتر هیچی نەگوت. دواجار گەنجە کوردەکە ڕووی کردە من و بە کوردی هەندێک شتی پێ گوتم، ئیتر لە مانای قسەکانی دەگەیشتم، زمان کەرەستەیەکە کە بە هۆیەوە دەتوانی بزانی لە دڵی مرۆڤێکدا، لە بوونی ئینسانێکدا چ دەگوزەرێت، من تێگەیشتبووم لەودا چ دەگوزەرێت، کەواتە ئەم کەرەستەیە نەیدەتوانی کۆسپ بێت. دەیگوت:

"هەتا ساڵێک لەوە پێشیش لاوانی عێراقی لە سنووری عێراقەوە دەهاتنە ئێران و چەکیان بۆ دێناین، چونکە ئەودەم دۆخی ئێمە خراپتر بوو، من لە تاریکیدا چاوەڕوانیان دەمامەوە، بەڵام ئەمڕۆ ڕێوی ئەم بەری سنوور ئازادە، ژیان ئاوایە، خەبات و کوڵنەدانی بەردەوامە".

ئیتر ئەو چوار لاوە تاوەسووتەی لەم لا و لەو لام دانیشتبوون، چوار لاوی سادەی دێهاتی نەبوون و ئەو تەلیسەی لە بن کۆشنەکە بوو دەتگوت ڕۆحی هاتووەتە بەر و دەجووڵێتەوە.

## ڕۆیشتن بەرەو بانە

ئەو شوێنەی پاسەکە لێی ڕایگرت، هەر ئەو شوێنە بوو کە بۆمبەکە لە وێ تەقیبووەوە. ئێستا ئیتر هۆکاری ڕووداوەکە دیار بوو. بەڵێ، بۆمبێکی گەورە تەقیبووەوە. بۆمبارانێک لە گۆڕێ نەبووە، هەندێک کەس کوژراون و شووشەی پەنجەرەی ماڵەکان هەتا مەودایەکی زۆر ورد بووە. کەسێک بۆمبێکی

تەوقیتی بۆ فرۆشتن هێناوەتە بازاڕ، یەکێکی تر ئامادە بووە بۆمبەکە بکڕێ بەو مەرجەی نیشانی بدەن چۆن کار دەکات. فرۆشیار بۆی شیدەکاتەوە، کڕیارەکە چەند قومبەلەیەکی بە بەرپشتێنەوە بووە و فرۆشیاریش قەد فیشەکدانێکی ڕاست و چەپی لە خۆی بەستووە. لە کاتی شیکردنەوەکەدا، ڕووداوێک دەقەومێت و بۆمبەکە لە دەستیاندا دەتەقێتەوە، لەت و پەتیان دەکات و هەر لە تەیان بۆ شوێنێک فڕێ دەدات. لە چاوترووکانێکدا، بڵێندگۆکانی شاری سەقز لە 60 کیلۆمەتری شاری بانە هاوار دەکەن "خەڵکینە، سوپا شاری بانەی داوەتە بەر گوللە". خەڵکیش لە شارەکانی دەوروبەر لە ماڵەکانیان دێنە دەر و هاوار دەکەن "خەڵکینە، فڕۆکەکان شاریان بۆردومان کردووە".

پێشمەرگە پۆل پۆل لە شارەکانی دەوروبەر دەڕژێنە بانەوە. بریندارەکان دەگوازرێنەوە بۆ نەخۆشخانە، کوژراوەکان دەنێژرێن. هۆکاری ڕووداوەکە ئاشکرا دەکرێت،

بەڵام کەس نایەوێت دانی پێدا بنێت، قسەی یەکە و نابێت بە دوو، کاری دەوڵەتە و گومانی تێدا نییە، لاوەکان کۆ دەبنەوە و پرسەکە تاوتوێ دەکەن:

"دەبێت دەرکەوێت بۆمبەکە بە دەستی چ کەسێکەوە بووە".

"دەبێت بزانین چ بۆمبێک بووە".

"دەبێت بزانین سوپای بەکرێگیراو لەو بۆمبەی هەیە، یان نا".

"دەبێت بزانرێت کەی تەقیوەتەوە".

"دەبێت بزانین چەند کەسی کوشتووە".

"دەبێت بزانین..."

ڕێگەکان تاوتوێ دەکرێن، سەرەداوێک لە سوپا و دەوڵەت دەست ناکەوێت، دیسان مشتومڕ دێتە گۆڕێ:

"لە شوێنێک هەڵەمان کردووە".

"شتێکمان پشتگوێ خستووە، حیسابمان بۆ نەکردووە".

"چۆن دەکرێت دەوڵەت لەم تەقینەوەدا دەستی نەبێت؟"

"بۆ مەریوان و سنە و نەغەدەتان لە بیر چووەتەوە؟"

لاوەکـــان دیـــسان ڕێ و ڕێـبـازەکـان هەڵدەسەنگێننەوە.

بە نێو شاردا پیاسە دەکەم، خەڵک هەموویان بـەرەو لای گەنجەکان ڕێنوێنیم دەکـەن و زۆری پێ ناچێت لەگەڵ دەستەیەکیان ئاشنا دەبم، ئێستا ئیتر زۆر بێ ئاگا نیم و سەبارەت بە کوردستان هەندێک شت فێر بووم، دەتوانم لەگەڵ لاوەکان سەبارەت بە خۆیان قسە بکەم و هەمدیس شتی نوێیان لێوە فێربم. لە بارەی گیروگرفتی کوردەکان و دۆخی گوندەکان، دۆخی هێزەکان و بارودۆخی شار پرسیار دەکـەم، بە زمانێکی زۆر سـادە دەڵێم هیچ نازانم و دەمەوێت بزانم ئەوان شتێکم نیشان دەدەن، بە شێوەیەک کە بکرێت زیاتر پێکەوە ئاشنا بین و گرفتەکان ئاسانتر چارەسەر بن.

خوێندکارێکی بەشی پزیشکیم ناسیوە. لاوانـــی شـــار زۆری ڕێـــزی دەگـــرن، ئـەو کـوردسـتـان وەک نەخۆشێک دێنێتە پێش

چاو و بە تێگەیشتنی پزیشکێکی زانا ئەو خاڵانەم نیشان دەدات کە دێشن و دەبێت نەشتەرگەرییان بۆ بکرێت. باسی ئەو هەتوانانە دەکرێت کە دەبێت بەکار بهێنرێن. تا لای نیوەڕۆ لە لای کوڕەکان دەمێنمەوە و ئەوان باسی هەموو شتێکم بۆ دەکەن. ئێستا من هەموویان دەناسم. زۆربەی هەرە زۆریان ئەوانەن کە ساڵانێکی زۆر لە گرتووخانەکانی محەممەد ڕەزا شای خیانەتکار ماونەتەوە و زوڵم و زۆرداریان چێشتووە، دەمەونیوەڕۆ کە دەمەوێت بڕۆم، لاوەکان داوا دەکەن لە لایان بمێنمەوە، شان بە شانی ئەوان دەچمەماڵێک، لەوێ چێشت ئامادە کراوە. هەموویان لە دەوری سفرە دادەنیشن، بەڵام دکتۆرە لاوەکە خەریکە چەکەکەی خاوێن دەکاتەوە، جەرگ و هەناوی دەرهێناوە و بە خولیا و ئۆگرییەوە تۆزی هەموو پارچەکان بە سەرنجەوە خاوێن دەکاتەوە. ئێمە چێشتەکەمان دەخۆین، دکتۆر زامنی چەکەکەی دەکێشێت، لە کن خۆی دادەنێت و دەست دەکات بە نانخواردن.

لە کوردستان، دەتوانی لە گیرفانی هەر منداڵێک دەمانچەیەک دەربێنی، منداڵەکە وەک چۆن خڕکە بەردێک لە سەر عەرزی هەڵدەگرێت و بە جامێکی دا دەدات، ئاواش دەتوانێت چەکەکەی بە دەستەوە بگرێت و سێرە لە دوژمن بگرێت.

**سەرێک لە گوندەکان دەدەین و زۆر شتمان بۆ دەردەکەوێت**

لای ئێوارە، لەگەڵ دکتۆر بۆ بینینی گوندەکان ملی ڕێگەیەکی پڕ کەند و پێچی نێوان تەپۆڵکەکانمان گرت. پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکرات بە ئۆتۆمبێلی سوپا بە جادەدا تێپەڕ دەبوون و چاودێریی ناوچەکەیان دەکرد. دکتور گوتی:

"ئەم حزبە، لێرە، لە ناو ئەم تەپۆڵکانەدا لایەنگری زۆرە، بەڵام هیچکات بە باشی هەڵسوکەوت ناکات. ئەم جووتیارانە لە شەڕکردندا نموونەیان نییە، وەلێ حیزب بە هیچ شێوەیەک سەرنج بەم پرسانە نادا،

تەنیا دەیەوێت ژمارەی ئەندامانی زیاتر بێت. سەیرکەن زیاتر لە پەنجا کەسیان وەک پەز سواری کامیۆن کردووە، ئەمە لەگەڵ کام یاسای سەربازیدا دەگونجێت؟ من ئەگەر دوژمن بم لەو سەرە ڕا دەتوانم بێ ئەوەی بجووڵێنەوە، هەموویان تەفر و توونا بکەم. بڕوانە دەتوانی لە سووچەوە نیشانەیان لێ بگریت".

ئەوسا سووچێکی نیشان دام. پێشمەرگەکان هێشتا هەستیان بە بوونی ئێمە لە ناوچەکە نەکردبوو، دکتۆرەکە لوولەی چەکەکەی جارێک سووڕاند و گوتی:

"سەیرکە چ سووک و سانا دەتوانی ئەم جووتیارە بەهێزانە لە ناو ببەی. ئەمە خەتای حیزبە، بە ڕاستی سامناکە. چەندە ڕەخنە لە ڕێکخستنەکانیان دەگرین، چەندە وشیاریان دەکەینەوە، دیسان گوێمان پێ نادەن، ئەوان بەس دەیانەوێت کەسانێکی زیاتر ببنە ئەندامی حیزبی دیموکرات. هەرچەند پێویست بەمە ناکات، خەڵکی دێ، خۆ بەخۆ،

له بەر ئەو مرۆڤە ڕووڕاستانەی لەو حزبە دابــوون، مەیلەو حیزبن، بــەڵام ڕێبەرانی حزب کەڵکی ئاوەژووو لەم مەیلە وەردەگرن کە بووەتە نەریتێک. سەیر کە بەو هەمووە دەرفەتەی هەیە و دەسکەوتی شەڕە، نابێت ئەمانە سواری کامیۆنی سوپایان بکەن و بە ناوچەکەدا بیانگێڕن. دەتوانن بە ژمارەیەکی کەمتریش بە نـاوچـەدا بگەڕێن. نابێت ئەم هـەمـوو هـێزە بێکار بهێڵنەوە. دەشـێت لە ڕوانـگـەی سیاسییەوە دیـد و تێڕوانینیان بەرز بکەنەوە، بەڵام حزب گوێی بەم شتانە نـابـزوێـت، وەک بڵێی نکۆڵی لـە ڕاهێنانی سیاسی بکات و لەوە بترسێت ئەندامەکانی هــەرەی لە بـڕەی بکەنەوە. دەترسێ ڕەگی کێشەکەیان نیشان بدا، دیارە ڕێبەرەکانیشی زۆر چارەی بینینی ڕەگی کێشەکانیان نییە، بەڵام پێشمەرگەی دیموکرات بەمە نازانێت، ئەو پەنجا ساڵ پێش ئێستا پێی وابوو تفەنگ ڕێگەچارەیە و ئێستاش پێی وایـە کە تەنیا تفەنگ ڕێگەچارەیە".

بە درێژایی ڕێ، وەرزێرەکان خەریکی دروێنە بوون، ژنان دەسکەنەیان دەکرد و منداڵ شان بە شانی ئەوانی تر کاریان دەکرد. لە شوێنێک دکتۆر جیبەکەی ڕاگرت و چووینە مەزرایەک. دکتۆر گوتی:

"تۆ دەتوانی کاری خۆت بکەی، منیش سەرێک لە وەرزێرەکان دەدەم".

بە گەنمەجاڕێکدا تێپەڕ بوو چووە نێو کەوێڵێک بۆ لای هەندێک جووتیار، منیش لە جێیەک ڕاوەستام کە چەند کەسێک دروێنەیان دەکرد. بە هۆی ئەوەی وایان دەزانی یەکێکم لە هاوڕێیانی دکتۆر، قسەم لەگەڵ کردن. وەرزێرێکی کورد کە ماڵەکەی لە سەر سنوور بوو، بە فارسییەکی دەست و پێ شکا و پێی گوتم:

"من لە کاتی خۆیدا نوێژەکانم دەکەم. ئەمن ڕژێمێکم دەوێت ڕێگە بدات بە سانایی نانەکەم بە دەست بێنم. ئەگەر نان لە گۆڕێ نەبێتت، بۆ من چ جیاوازییەکی هەیە شا بێت، یان ئەمەیان".

ئاماژەی بە دکتۆر کرد و گوتی:

"ئەمن ئەوانەم قبووڵە، دەزانی بۆچی، چونکە فێریان کردووین حیسابی نان جیاوازە، فێریان کردووین ئەگەر مان بگرین، ئەگەر لە دەوری یەک کۆ ببینەوە، دەتوانین توتن گرانتر بە دەوڵەت بفرۆشین. ئاغا! ئێمەی توتنکار هەمووومان ڕۆیشتین، لە نووسینگەی دەوڵەت دانیشتین و گوتمان دەبێت توتنی گران بکڕن. ئاغا! چەند ساڵ لە مەوپێش خۆمان لە دار و بەرد دابایە، توتنیان هەر بە حەوت تمەن لێ دەکڕین، بەڵام مانمان گرت، پشتی یەکترمان گرت و بوو بە بیست تمەن. دەبینی ئاغا، دەبێت مان بگریت".

پاشان گوتی:

"بەڵام ئەوانەی دەوڵەت ڕۆحمان دێننە پێش چاو بۆ ئەوەی پارووە نانێک لە قورگمان بچێتە خوار".

چەند گوڵەگەنمێکی هەڵقەند، دەنکەکانی دەرهێنا و نیشانی دام، گشتیان ڕەش و کرمێ بوون، هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

"دەبینی ئاغا، ئێوەی فارس کۆمەڵێک مرۆڤی نالەبارن، دەوڵەتیش هی ئێوەیە. ئەم گەنمە سەمادی پێویستە، دەرمانی پێویستە، بەڵام دائیرە پێمان نادات، دەڵێت کوردستان ناثارامە، ئێمە ناتوانین بەشتان بدەین. ئەخە ئاغا کوێی کوردستان نائارامە؟ چ خودا بەرداره ئەو هەمووە ماندوو بم و پاشان گەنمەکەم کرمێ بێت؟"

ئەو دەستەی گوڵەگەنمەکانی پێ هەڵقەندبوو، هەڵدەلەرزی، ئەم جارەیان دەنگی هەڵبڕی:

"بۆیە خودموختاریمان دەوێت، ئەگەر خودموختاریمان بە دەست هێنا، کوێرەوەریی و ماندوو بوونم بە فیڕۆ ناچێت، پارەکەم ناچێتە گیرفانی فارسەکانەوە، نابێتە دەرمان بۆ فارسەکان، نابێتە سەیرانگە و ئاو و سینەما بۆ فارسەکان. ئەوسا پارەکەم دەبێتە پشکی خۆم، دەبێتە دەرمان و گەنمەکەم کرم لێی نادا..."

دیسان دکتۆرم پێ نیشان دەدا:

"ئەگەر ئەم دکتۆرە نەبێت، منداڵەکەی من دەمرێت، بەڵام بە دکتۆرێک هیچ ناکرێت. دەوا و دەرمانمان پێویستە، دکتۆری بێ دەوا و دەرمان چ بکات؟"

دکتۆر پێی گوتبووم:

"کێشەکانی ئەم ناوچەیە، کێشەی جڤاکین، کێشەی ناوچەیین، جووتیار دەرفەتی نییە بە منداڵەکەی ڕابگات، هەر ئەم گوندەی خوارەوە لە دە خێزان پانزە کەس منداڵەکانیان ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕابوو زۆری نەمابوو بمرن، هاتین و بینیمان خۆڵ دەخۆن، دە ساڵە خۆڵ دەخۆن و کەس گرنگیان پێ نادات. نەگبەتی دەستەودامێنی گرتوون، ڕێگە و بان نییە، لە کوێرەدێیەک کە لە بەر بێ ئاوی لە نشێوی دۆڵێک ساز کراوە، چۆن دەکرێت نەخۆشێک ببەیتە شار؟ بە کام ڕێدا، بە کام کەرەستە، لێرە کەس نابێت نەخۆش بکەوێت، چونکە یان دەبێت بە درێژایی تەمەن ئازار بچێژێت، یان دەبێت هەتا زووە بمرێت".

جووتیارەکە، گەنمە ڕەش هەڵگەڕاوەکانی فڕێدا، داسەکەی هەڵگرت، ڕووی تێکردم و گوتی:

"ئێمە لە سەردەمی حەمە ڕەزا شاشدا خودموختاریمان دەویست، ئێستا چۆن نەمانەوێت. لێرە کۆمەڵێک پیاوی ڕێکوپێکمان هەیە کە بە هیچ شێوەیەک واز ناهێنن. ئێمە کەسانی وەک شەریف زادەکان، وەک مەلا ئاوارەکان و وەک موعینییەکانمان هەبووە، ئێستاش کەسانی وامان هەیە".

کاتێک هەستی کرد لەوە دەچێت من سەرەدەر لەم شتانە دەرنەکەم، سەری ڕاوەشاند و گوتی:

"ئێوەی فارس بەس خۆتان دەناسن، ئێمە پیاوی وامان هەیە لە نێو فارساندا نموونەیان پەیدا نابێت. ئەوان بە درێژایی تەمەنیان شەڕیان کردووە".

بە بیر قسەکانی دکتۆر کەوتمەوە کە گوتبووی:

”ئێوە بەس گۆرانیبێژ، شاعیر و نووسەری تارانی دەناسن، وەرن و بزانن ئەم کوردانە چ دەکەن، لە شیعردا چ شاکارگەلێکیان ئەفراندووە، سترانەکانیانت بیستووە؟ شیعرەکانی ئەوانت خوێندووەتەوە؟ سروودەکانیان دەناسی؟ دەزانی قانع کێیە؟“

لە وەڵامی دکتۆردا هیچم بۆ گوتن پێ نەبوو.

دکتۆر هەروا لەگەڵ جووتیارەکان قسەی دەکرد، بەدڵنیاییەوە سەبارەت بە گرنگیی یەکگرتنی جووتیاران قسە دەکات. یان بە نەخۆشێک دەڵێت قەی ناکات دەرمان دەست ناکەوێت، پشوو بدە، خۆت ماندوو مەکە. لە ڕێگەدا پێی گوتبووم ئیتر هەر ئەمەیە دەبێت پشوو بدا هەتا دەمرێت، یان بە دەرمانی خۆماڵی هیچ نەبێت بۆ ماوەیەک پێش بە بەلەفیرەیان بگرن“.

دانی بەیانی کە بە نێو شاردا پیاسەم دەکرد، بینیم کۆمەڵێک کەسی خەڵکی دێ لە دەوری شتێک کوزیلکەیان بەستووە، کە خۆم

گەیاندە لایان بۆم دەرکەوت گەنجێکی ملهوڕی سیستانی کۆلێک دانەوێڵە و گژوگیا و دەرمانی خۆماڵی لە دەوری خۆی کۆ کردووەتەوە و خەڵکی دەرمان دەکات. ژنێکی جحێڵ لە پیاوە ملهوڕەکە هاتە پێشێ و گوتی:

"دڵم لە ژێڵڵا دێ، خواردنم بۆ ناخورێت، دەڕشێمەوە".

پیاوە سیستانییەکە گوتی:

"ئادەی زمانت دەربێنە".

ژنەکە زمانی دەرهێنا. ڕەش ڕەش بوو. پیاوەکە گوتی:

"چارەسەرت دەکەم، بەڵام سی تمەنی خەرجە".

ژنەکە لە بێبەختیان دەیناڵاند. پیاوە سیستانییەکە گوتی:

"باشە بیست و پێنج تمەن".

ژنە جحێڵەکە شەرمەزار بوو کە بیست و پێنج تمەنی نییە. ئەو لاوانەی دەوروبەری پیاوە سیستانییەکەیان گرتبوو، چاویان لێ تیژ

کردەوە، پیاوەکە هەندێک ئەملا و ئەولای کرد، چاوێکی بە دەوروبەریدا خشاند و گوتی:

"دەی قەی ناکات تۆ پانزە تمەن بدە".

کوردەکان سیمایان کرایەوە. سیستانی چەند دەنکێکی تێکەڵ بە یەک کرد و گوتی:

"ئەمانە دەکوتی، ڕۆنیان تێکەڵ دەکەیت و کاتی نووستن دەیانخۆی، دوای چوار شەو چاک دەبیتەوە".

ژنە جحێڵەکە دوعای کرد، دەرمانەکەی وەرگرت و دوورکەوتەوە.

ئینجا لاوێکی دێهاتی خۆی نیشانی دەرمانفرۆشەکە دا و گوتی:

"سەرم لە گێژەوە دێت، قورس دەبێت، دروێنەم بۆ ناکرێت".

پیاوە سیستانییەکە بن نینۆکەکانی داگرت، چەند جارێک پشت دەستی کوتا، پاشان چاوێکی بە جەماوەرەکەدا خشاند و گوتی:

"دەرمانەکەی بایی پانزە تمەنە..."

بە جیب بە ڕێگە کوێستانییەکاندا تێپەڕ دەبووین، دکتۆر گوتی:

"سەیری ئەم ڕێگەیانە بکەن، ئەگەر سوپا بیەوێت لە ڕێگەی بەژاییەوە شەڕ بکات، فاتیحای خوێنراوە. خەڵکی دێ، بە چاونووقانەوە دەتوانن لەم ڕێگەوبانانە دەست بکەنەوە".

جادەکە پڕ پێچ و پەنایە و ڕواڵەتێکی سامناکی هەیە. کاتژمێرێک بە ڕێوە دەبین تا دەگەینە گوندی بەردەڕەش. دکتۆر جیبەکەی لە بەردەم ئاسنگەریی پیاوێکی پیر ڕاگرت و گوتی:

"با سەرێک لێرە بدەین، بزانن تەنانەت چاخی ناوینیش بە کەرەستەی ئاوا کاریان دەکرد. بینینی گوند و قسەکردن لەگەڵ خەڵکی دێ خەلاتێکی گەورە بوو کە وا بە هاسانی دەست نەدەکەوت. لە شار ئەگەر بە هەر کەسێکم گوتبا دەمەوێت بچمە دێ، بە پەرۆشەوە دەیگوت:

"چما شێت بووی، ئیشت بەوێ چییە؟"

لە واتای ئەم قسەیە نەدەگەیشتم، پێم وابوو مایەی نیگەرانی نییە. بۆ مەگەر نەچووبووینە

گوندەکانی دەوروبەری پارێزگای مەرکەزی، یان دەوروبـەری شیراز و ئیسفەهان. ئەگەر بچینە ئەو دێهاتانە، مایەی ترس و دڵەڕاوکێ نییە، بـەڵام کاتێک گوندەکانی کوردستانم بینی، تێگەیشتم بۆچی دەبێت نیگەران بی. ئەم گوندانە، نەخوازە گوندەکانی نزیک سنوور، لـە داوێـنـی دۆڵـێـک، یـان گـردێـک ئـاوەدان کراونەتەوە، لە دە پانزە بنەماڵە پێکهاتوون، کۆمەڵێک خانووی سـادە کە بە کەرەستەی سەرەتایی و کۆن چێ کراون، لەم گوندانەدا بە قاڵی، نانەواخانە، یان قەسابی یاخود شتی لەو بابەتە بەدی ناکەی. چەند چوار دیواری بچووکی گڵینیان بە یەکەوە ناوە بۆ ئەوەی خـۆریـان بـەر نـەکـەوێت، یـان لـە جەنگەی خـەودا بـاران لە خـەویـان هەڵنەستێنێت. بە درێژایی تەمەنیان، بێگانەیەک ڕووی لەوێ نەکردووە، تەنیا دەتوانین بڵێین لە سۆنگەی ئەوانەوە ژەندەرمەکان سەمبۆلی غەریبە و نوێنەری فارسەکان بوون. ئەمە نموونەیەکە بـۆ ناسین و تێگەیشتنیان لـە فـارسـەکـان،

نموونەی تر دەبێت لە مێژوودا بە دووی ڕیشەکانیدا بگەڕێی. فارسەکان بەردەوام بە قەڵافەتی جۆراوجۆر حوکمڕانییان بەسەردا کردوون. ڕەزاخانی ملهوڕ لاوەکانیانی کوشتووە. ژنەکانیانی خستووەتە ژێر چنگی ژەندەرمەکانەوە. محەممەد ڕەزاخانی خۆفرۆش بەردەوام لە بۆسەی دلاوەرانی کورد دا بووە، دەستبەسەری کردوون، ڕەوانەی ئەشکەنجەخانەکانی کردوون. دەوڵەتی ئێستاش، کە وەک ئەو کابرایەی خەڵکی دێ دەیگوت لە پاریس قسەی جوانی دەکردن و هەنووکەش لە قوم بووەتە دەوڵەتی محەممەد ڕەزاشا، هەمدیس وەک پێشوو کوردانی ئازادیخواز لە خاک و خوێن دەگەوزێنێت. بۆیەشە دیهاتییەکی کورد جیاوازییەک نابینێت لە نێوان کۆمەڵانی خەڵک و دەوڵەت. دوڵەتە ملهوڕەکانی فارس و کۆمەڵانی زەجرچێشتوو لێک هەڵناهاوێرێت. بۆچی دەبێت چارەی فارسەکانی بوێت؟ بۆچی هێڵێک نەکێشێتەوە و ڕێگە نەدا فارس پێ بنێتە ئەم دەڤەرەوە؟

ئەمە ویستی دەوڵەتانی گوێڕایەڵە لە نێوان گەلاندا دووبەرەکی هەبێت، خواستی ئەوانە دێهاتییەکی کورد هێڵێک دروست بکات و بڵێت ئیتر نابێت فارس ئەم هێڵە ببەزێنن. ئەمە یارییەکی سادەی ئیمپریالیزمە کە گۆپاڵێک دەداتە دەست کورد و تێلایەک دەدا بە فارس بۆ ئەوەی هەڵبکوتنە سەر یەکتریی و بەرببنە گیانی یەکدی و لەم دەرفەتەشدا ماڵ و حاڵی هەردووکیان تالان بکات.

کە فارسێک پێ دەنێتە گوندە دوورەدەستەکانی کوردستان، نیگاکان جموجوڵی دەشۆپێنن و هەموویان سەرەتا لە خۆیان دەپرسن:

"تۆ بڵێی پیاوی دەوڵەت نەبێت؟"

"تۆ بڵێی فرت و فێڵی نەبێت؟"

"تۆ بڵێی سیخوڕی قوم نەبێت؟"

"هەواڵ ناهێنێت و نابا؟"

دکتۆر دەیگوت:

"ئەوان بە چوار چاو لێت دەنۆڕن، بەردەوام لێم دەپرسن ئەم فارسە چی دەوێت.

پێیان دەڵێم پیاوێکی باشە، دەیەوێت سەبارەت بە کوردەکان بنووسێت، هاوڕێی کوردانە، کوردەکانی خۆش دەوێت".

ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن:

"بۆ فارسیش دەتوانێت کوردی خۆش بوێت؟"

دکتۆر وەڵام دەداتەوە:

"بەڵێ، فارسی وا هەن کوردیان خۆش دەوێت. گەلانی وا هەن چاویان بڕیوەتە سەرکەوتنی کوردەکان، گەلانی وا هەن لە سەر هەستن بۆ ئەوەی بزانن گەلی کورد چ دەکات تا ئەوانیش هەستنە سەر پێ".

**لە گوندی بەردەڕەش چاومان بە زارا دەکەوێت**

کە گەیشتینە گوندی بەردەڕەش و سەرمان لە دوکانی ئاسنگەری پیر دا، چەند منداڵێکی خەڵکی دێ هاتن و دکتۆریان لەگەڵ خۆیان برد. دکتۆر منی بە کورپێژگەیەک سپارد.

ئاسنگەرەکە خەریکی دروستکردنی داسێک بوو. کورەیەکی بچووکی هەبوو کە ئاسنەکانی

تێدا قاڵ دەکردەوە. سەرجەم کەرەستەکانی دووکانەکەی بریتی بوون لە سندانێک و چەکوچێک و چەند لەتە ئاسنێک. لێم پرسی ڕۆژانە چەند داس دروست دەکەی؟ داهاتت چەندە؟ دکتۆر پێی گوتبوو:

"ئەم میوانەمان پیاوێکی خراو نییە. ئاگات لێی بێت".

بۆیەش، ئاسنگەر لە تووتنی مەزراکەی خۆیان جگەرەیەکی بۆ پێچامەوە، پێی دام و گوتی: (دیارە فارسی نەدەزانی کوڕەکەی بۆی وەردەگێڕام.)

"ڕاوەستە با پێت بڵێم داهاتی ڕۆژانەم چەندە. با بۆت باس بکەم".

دووکانەکەی لە بناری تەپۆڵکەیەک بوو، کەمێک ئەولاتری دەرگای دووکانەکەی دۆڵێکی قووڵی پڕ لە داربەڕوو زاری لێک کردبووەوە. ئاسنگەر، داسەکەی خستە نێو ئاگردانەکە و گوتی:

"ڕۆژێک دوای ساڵانێکی زۆر بە خۆمم گوت با سەرێک لە شاری هەڵێنم، دەرگەی

دووکانم گاڵەدا و وە ڕێ کەوتم، دەورێکم بە شاردا لێ دا. لە سەرتاشخانەیەک بینیم سەرتاش ڕیشی کەسێکی خەڵکی شار دەتاشێت. سەرتاشەکە پەڕۆیەکی سپی خاوێنی لە ملی موشتەرییەکەی هاڵاندبوو، بە شتێکی سابوونی لە ڕیشی دا و کەفێکی زۆری چێ کرد. گوێزانەکەی خاوێن کردەوە و بە سەرنجەوە ڕیشی موشتەرییەکەی تاشی. مەیلم بزووت بۆ ئەوەی ڕیشی منیش بەو شێوەیە، بەو هەموو کەفە و بەو گوێزان و ئاوێنە و پەڕۆ خاوێنە بتاشێت. بە ژوور کەوتم، لە سەر کورسییەکی بەرامبەری ئاوێنەکە دانیشتم. پەڕۆیەکی لە ملم هاڵاند. سابوون و ئاوی گەرمی لە ڕیشم دا و..."

پیرەپیاوەکە دەستێکی بە ڕووخساریدا هێنا، دەتگوت ئێستاش لە سەر پێستی هەست بە ئاوی شیلەوتێن و سابوونەکە دەکات.

"ئینجا ڕیشی تاشیم. دڵخۆشانە هەستامە پێ و سەربەرزانە تمەنێکم لە سەر مێزی سەرتاشەکە دانا. دەسرەکەم دەست دایە

بۆ ئەوەی بڕۆم، لەپڕێکدا کابرای سەرتاش هاواری کرد: هۆی، بۆ کوێ؟ پارەکەت بدە".

ئاسنگەر ئارەقی نێوچەوانی سڕییەوە.

"گوتم بێگومان بە هەڵەدا چووە. تمەنێکم لە سەر مێزەکەی دانابوو. کابرای سەرتاش دەستی ڕاداشت و گوتی پارە بدە، چما دەتەوێت خێر بکەی، هەمووی بدە. بە خۆم دا شکامەوە و تمەنێکی تریشم پێ دا. سەرتاشەکە تووڕە بوو گوڕاندی: دەڵێم هەموو پارەکەم بدەیە کاکە. خەڵک سەیری ئێمەیان دەکرد. تمەنێکی دیکەشم دایە. ئەمن چووزانم دەبێت چەندی بدەم. پارەیەکی زۆر بوو. بە خەفەتەوە لە دووکانەکە هاتمە دەرێ و ئەم داخە بە ساڵان لەسەر دڵم مایەوە. هێشتاش کە ڕیشم دەتاشم بە بیر ئەو سەرتاشە، نیگاکانی دەوروبەر، ئەو سابوونە گەرمە، ئەو سێ تمەنە..."

ئاسنگەرەکە ئیستێکی کرد و بەردەوام بوو:

"دوای ساڵانێکی زۆر، من هێشتاش لە دوو جار ڕیش تاشینی ئەوکات زیاتر پارەم دەست ناکەوێت. ئەوپەڕەکەی، ڕۆژانە پارەی

دوو جار ڕیش تاشین و پارووە نانێکم دەست دەکەوێت".

چاوێکی بە دەوروبەریدا گێڕا و گوتی:

"پێتان وایە کێ دێتە ئێرە؟ بێجگە لەم ئاسنگەرییەش هیچم لەدەست نایە".

پشتی چەمابووەوە و ئێسکەکانی لەشی دەرپەڕی بوون.

ئاسنگەر جگەرەکەی کێشا. داسە سووربووەوەکەی لە ئاگردانەکە هێنایە دەرێ و گوتی:

"ئێمە لێرە دوو کەسین و لە بەیانییەوە تا ئێوارە کار دەکەین".

کاتێک گوتی دوو کەس لێرە کار دەکەین، چاوم بە دەوروبەرمدا گێڕا بۆ ئەوەی کەسی دووەم ببینم. چاوم بە کەس نەکەوت. کە دیسان داسەکەی خستە نێو ئاگردانەکەوە کەسێکی بانگ کرد بۆ ئەوەی ئاگرەکە خۆش بکات. ئاگرەکە خۆش کرا. سەیرێکی چوار دەوری خۆم کرد بۆ ئەوەی بزانم کێ ئاگرەکەی خۆش کردووە. کە داسەکە دیسان

سوور بووەوە، ئاسنگەر هاواری کرد چیتر ئاگرەکە خۆش ناکرێت و ئاگرەکە خۆش نەکرا. دیسان لە چوار دەوری خۆمم ڕوانی. دووکانەکە کەسی لێ نەبوو. کوونێک لە نێو دیوارەکەدا سەرنجی ڕاکێشام. بەرەو کوونەکە چووم کە دەیبردییە ژوورێکی بەرتەسکی پشت ئاگردانەکە. تاریک بوو. لەوێوە دەنگێک دەهات، بەڵام هێندە تاریک بوو کەس نەدەبینرا. زیاتر چوومە پێشێ. دەنگی هەناسەی کەسێک دەبیسترا. سەرم بە کوونەکەدا بردە ژووری. ژوورێکی بچووک بوو هەر هێندەی کوولانە مریشکێک دەبوو. کە چاوم بە تاریکی ڕاهات کەرەستەیەکم بینی کە ئاسنگەرەکان بۆ ئاگرخۆش کردن بەکاری دێنن، بەڵام ئەو کرێکارەی کەرەستەکەی بەکار دێنا، نەدەبینرا. گوتم:

"ئەوە کێیە؟ کێیە ئاگرەکە خۆش دەکات؟"

دەنگێکی ئارام و نەرمونیان و کچانە گوتی:

"ئەمنم، زارا".

دەنگەکە ڕایچڵەکاندم، گوتم:

"ئادەی، با قەڵافەتت ببینم".

لە نێو تاریکی، لە پشت دەزگاکەوە، دوو چاوی بریقەدار وەک چاوانی بێچووە ئاسکێک کە لە ڕاوچی سڵی کردبێت، بە دەرکەوتن. ئێستا کە خۆی نیشان دابووم، نەمدەزانی بڵێم چی. بە ئەسپایی گوتم:

"سڵاو زارا، خاسی؟"

کچۆڵەکە ماوەیەک تێم ڕاما، تا ئەو کاتەی پیرەمێردەکە بانگی کرد و زارا دیسان ئاگرەکەی خۆش کردەوە. سەرم لە کوونەکە هێنایە دەرێ. بینیم دکتۆر لەبەر دەرگا ڕاوەستاوە و پێدەکەنێت. گوتی:

"زارات بینی؟"

چاوەکانم لە بەر ڕووناکی هەڵنەدەهاتن. چەند کەسێکی خەڵکی دێ لەگەڵ دکتۆر هاتبوون و لە پێش دووکانی ئاسنگەری کۆ ببوونەوە. دکتۆر گوتی:

"وەرە گوێ لە قسەی ئەمانە بگرە".

دیارە پێشتر پێی گوتبوون کە من دەمەوێت سەبارەت بە کوردەکان هەندێک شت بنووسم.

پیاوێکی کەڵەگەت ڕووی تێ کردم و گوتی:
"ئاغا من لە سەردەمی محەممەد ڕەزا شادا هەشت ساڵ لە گرتووخانەدا ماومەتەوە".
گوتم:
"خوێندەواریت هەیە؟"
گوتی:
"خوێندەواریم نییە، بەڵام کورد بەردەوام داوای ماف و ئازادیی کردووە و دەوڵەتیش بەردەوام کوردەکانی کوشتووە، بەڵام ئەوان دەبێت باش بزانن ئەم کوردە ئەمڕۆ ئازادی گەرەکە. سبەینێش کوڕەکەی و دووسبەیش کوڕی کوڕەکەی داوای ئازادی دەکەن. کوردەکان هەر زیاد دەبن، لە ناو ناچن، دەوڵەتەکانن دەڕووخێن و لە ناو دەچن. تێدەگەی ئاغا؟"
دێهاتییەکی تر کە سەروبەندی شۆڕش لە گرتووخانە ئازاد ببوو، گوتی:
"ئێمە ناڵێین بەس با گەلی کورد ئازاد بێت، ئێمە بەس خەبات بۆ خۆمان ناکەین، هەموان دەبێت ئازاد بن. تورکەمەن، بلوچ، تورک،

گشتیان. کێشە تەنیا ئێمە نین، لە هەموو شوێنێک ئاوایە. دێهاتی بلوچەکانیش وەک دێهاتی ئێمە وایە. بڕۆن سەرێک لە ماڵەکانی ئێمە بدەن، دەبینن حەماممان نییە، کارەبامان نییە، دەوا و دەرمانمان نییە، هیچمان نییە. منداڵەکانمان دوو پۆل دەخوێنن و تەواو دەبێت. ئەخر ئاوا نابێت خۆ. خۆتان بڕۆن و ژیانی ئێمە ببینن. سەرەڕای ئەوەش ئێمە بەس بیر لە خۆمان ناکەینەوە".

لەگەڵ ئەو کوڕەی دکتۆر پێی ناساندبووم، بە نێو دێدا پیاسەمان کرد. هەڵبەت بە جۆرێک نەبوو کە شێوەی دێ بدات. لە نشێوی گردێکدا چەند ژوور بە حەوشەی بچووکەوە لە پشت یەکتری دروستکرابوون. ژنەکان لە بەر دەرگە دانیشتبوون و خورییان دەڕست. منداڵەکان لە نێو کۆڵانەکاندا وێڵ بوون. بێدەنگی و هێمنی بە سەر گوندا زاڵ بوو. گەناوی ماڵەکان بە کوونێکدا دەڕۆیشتە خوارێ. مێش و مەگەز پۆل پۆل دەفڕین، خۆر لە گەناوەکەی دەدا و بۆگەن بەو ناوەدا بڵاوببووەوە. کوڕەکە گوتی:

"ئێمە خزمەتگوزاری تەندروستیمان نییە، حەماممان نییە. لێرە بەس کار هەیە. ژن و پیاو و منداڵ بەیانیان دەچنە مەزرا و بەس نەخۆش و منداڵی بچووک لە ماڵێ دەمێننەوە".

کە بە تەنیشت منداڵەکاندا دەڕۆیشتم، لە بەرم هەڵدەهاتن و دەیانگوت:

"بەخێر بێی".

کوڕەکە گوتی:

"ئەوانە کەسیان نەدیوە پانتۆڵی لەبەر کردبێت و قایشی بەستبێت. لە مرۆڤێک دەترسێن، کە قاتی لەبەر کردبێت".

سەروبنی گوندەکەمان کرد، بە هەموویەوە پێنج خولەکی پێ چوو. سەرجەم ماڵەکانمان بینی. لەوێ کۆڵان یاخود گۆڕەپانێک بەدی نەدەکرا. سێ چوار ڕیزە ماڵ کەلێنێکی بەرتەسکیان لە نێوان دابوو، ئەویش بۆ ئەوەی یەکێک بتوانێت هاتوچۆ بکات. کە بە گونددا سووڕاینەوە و هاتینەوە شوێنی خۆمان، منداڵەکان زیاتر ببوون. دەهاتنە پێشمان و لە مەودایەکی دیاریکراو ڕا دەیانگوت:

"بەخێر بێی". لە شوێنێک منداڵێک لە من ترسا و هەڵتەک هەڵتەک خۆی بە ماڵی داکرد، لەودیو پەنجەرەی ژوورەکەیانەوە، نازانم لە توورەییان، یان لە خۆشیان هاواری کرد:

"بەخێر بێی عەجەمەکە، بەخێر بێی".

مرۆڤ بە بینینی ئەم شتانە موچوڕکی بە لەشدا دێت.

کە دیسان گەڕامەوە بۆ دووکانی ئاسنگەرەکە، بینیم دکتۆر قسە بۆ خەڵکی دێ دەکات و پێیان دەڵێت چۆن دەبێت یەک بگرن، چۆن شوورا دابمەزرێنن و چۆن درێژە بە خەبات بدەن. دکتۆر سەبارەت بە لاوازیی حزبەکان، ئەو گیروگرفتانەی هەن و ئەو مەسەلانەی دەبێت بێنە گۆڕێ و هەروەها سەبارەت بە یەکێتیی و ڕێکخستن قسەی بۆ دەکردن. بارودۆخی باوی بۆ شی دەکردنەوە و پێی دەگوتن دوژمن کێیە و ئەم دەوڵەتە دەتوانێت چ ڕۆڵێکی هەبێت.

ئاسنگەر کارەکەی تەواو کردبوو، زاراش لە کوونەکە هاتبووە دەرێ و خەریکی

کۆکردنەوەی کەرەستەکانی ئاسنگەرەکە، واتە باپیری بوو. خۆی بۆ ڕۆیشتنە ماڵەوە ئامادە دەکرد. پیرەمێرد گوتی:

"بەیانیان لەگەڵ خۆم دەیهێنم، خۆ لەو کوونە دەخزێنێت و تا ئێوارە پێکەوە کار دەکەین".

دڵم گیرابوو. ئێستا کە لەو کوولانەیە هاتبووە دەرێ، قژە زێڕینەکانی، چاوە مەستەکانی و دەستە بچووکەکانی لە ژێر تیشکی خۆری دەمەوئاوابووندا بە جوانی دەبینران. کەلوپەلەکانی ئاسنگەری کۆکردەوە، لە سووچێک دانیشت و نوقمی ڕوانینی ئێمە بوو. بیری لە چی دەکردەوە؟ لە بەیانییەوە تا ئێوارە، لەو کوونە و لە دووکان پێکەوە کار دەکەن بۆ ئەوەی ڕۆژانە داسێک دروست بکەن. ئینجا ئێوارە باوەگەورە لە بەر دەرگەی دووکان لەگەڵ پیاوەپیرەکانی تر دادەنیشێت و جگەرە بە با دەکات. زارا دەگەڕێتەوە ماڵێ و دەنوێت. یاری و کچانی تر بە تۆن، بەڵام بۆ کچانی تر لە کوێن؟ ئەوانیش لە کوولانەیەکی

دیکەدا خەریکی کار و کوێرەوەرین. دکتۆر دەڵێت با بڕۆین، دەکەوینە ڕێ و ماڵئاوایی لە وەرزێرەکان دەکەین. زارا لە سووچێکی دووکانەکە دانیشتبوو، هەروا سەیری ئێمەی دەکــرد. لـە دووکـانـەکـە دوورکـەوتـینـەوە و ســواری جێبەکە بووین. دکتۆر، چەکەکەی لە بن لاقەکانی دانـا. هەر ویستمان بکەوینە ڕێ، زارا هاتە بەر دەرگەی دووکانەکە، ئێمە ڕۆیشتین و زارا کەمێک ئـەولاوەتـر لەسەر بەردێک دانیشت. سەیری ئێمەی دەکـرد کە هێدی هێدی دووردەکەوتینەوە. بە دکتۆرم گوت ئۆتۆمبێلەکەی ڕابگرێت. جیبەکە ڕاوەستا. جانتاکەم چەند بەستە نانی شیرینی تێدا بوو، دەرمهێنان و بە ڕاکردن خۆم گەیاندە زارا. نانەکانم خستە ناو کۆشی. بێ ئەوەی سەیریان بکات، کە بینی دووردەکـەومـەوە، دەستی ڕاوەشاند و گوتی:

"بەخێر بێی کاکە، بەخێر بێی".

کە لە تەنیشت دکتۆر دانیشتم و جیبەکە کەوتە ڕێ، دکتۆر لە قاقای پێکەنینی دا.

بە بەندەنەکاندا شۆڕ بووینەوە، من بیرم لەوە دەکردەوە ڕۆژێک دادێت ئازادی سەقامگیر دەبێت و لە تۆڵەی ئەو ئازارانەی چێشتوونی، منداڵەکانی لە کوردستانێکی ئازاد و ئاوەدان دەژین.

**بەشداری کۆڕی پرسەی شەهیدانی بانە دەبین**

کە لە گوندی بەردەڕەش گەڕاینەوە شار، شەو داهاتبوو. دکتۆر گوتی:

"پێویست ناکات بچیتە موسافیرخانە، لە لای کوڕەکان بمێنەوە".

شەو لەگەڵ یەکێک لە کوڕەکان چوومەوە ماڵێ. دوای خواردنی نانی شەو بڕیارمان دا بچینە مزگەوت. لە ڕۆژی تەقینەوەی بۆمبە دەستییەکەدا خەباتگێڕێکی کورد کوژرابوو. ئەو یەکێک بوو لە پێشمەرگەکانی شاری بانە. بڕیار بوو لە مزگەوت مەلایەکی تێکۆشەری ناوچەکە قسە بکات. لاوانی شار گشتیان هاتبوون و ئەم کۆبوونەوەیە زیاتر بۆ نیشاندانی یەکگرتنێک بوو کە لاوانی کورد

دەیانەویست بــەردەوام بیپارێزن. سەعات دەوروبـەری یانزەی شەو بوو کە مەلایەکی کەڵەگەت بە ڕیشێکی چڕ و عەبایەکی درێژەوە وەژوور کــەوت. هـەمـوویـان بـە نیشانەی ڕێزگرتن لە بەری هەستان. مەلاکە بێ ئەوەی دابنیشێت، بـەرەو میحراب چــوو، ڕووی لە جەماوەر کرد، بە تووڕەییەوە دەستی خستە نێو قەدی و گوتی:

"ئەو گەوجانە چی دەڵێن با بیڵێن، کورد واز لە چەک ناهێنێت".

ئێوارەی هەمان ڕۆژ، دەستەیەک لە قومەوە هاتبوون و داوایـان لـە ڕێبـەرە ئایینییەکان کردبوو بە ئامۆژگاری کوردەکان چەک بکەن و ئەویش ئێستا لە وەڵامدا بە تووڕەیی پێی دەگوتن:

"بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتوون، گەپجاڕینە".

لاوەکـــان قیتتر و پێداگرتـر لـە مـەلا ڕاوەســتــابـوون، هـەسـتـیـان بـە گرنگی و پێداویستی یەکگرتن دەکرد. دەتوانین بڵێین

لاوەکان بچووکترین ئینتیمایان بۆ ئایین نەبوو، بەڵام دەیانزانی ئەم مەلایە چ کاریگەرییەکی لەسەر خەڵک هەیە. کەوابێت هەر بژی مەلای تێکۆشەری بانەیی، کەوابێت دەبێت چەک لە شان قورس و قایم ڕابوەستی، گوێ لە قسەکانی بگری و پشتیوانی لێ بکەیت.

مەلا درێژەی بە قسەکانی دا:

"ئاخوند ناتوانێت وڵات بەڕێوە ببات. ئێمە پێمان وایە ئاخوند ناتوانێت وڵات بەڕێوە ببات".

من لە مانای قسەکانی نەدەگەیشتم، لێ دەمتوانی هەستیان پێ بکەم. دواتریش لاوەکان قسەکانییان بۆ وەرگێڕامەوە:

"ئەو ئاخوندەی ئێمە ناسیومانە، ناتوانێت. بەڵێ، ناتوانێت. دەبێت شوراکان وڵات بەڕێوە ببەن. کۆمار، ئیسلامی ناوێت. ئیسلام بە جودا، کۆمار بە جودا".

مەلاکە گوتی ئەوانەی ئاخوندەکان وەک پێغەمبەر دەناسێنن، با باش بزانن وەک کەو وان و ئەم جارەیان سەریان کردووەتە نێو لیتاوەوە.

ئەم قسەیەی وەڵامێک بوو بۆ بێژەرانی ڕادیۆ کە ڕێبەرانی قومیان وەک پێغەمبەر، وەک ئیمام و نوێنەرانی خودا پێناسە کردبوو.

"ئەوانە واز لە پێغەمبەریش ناهێنن. چەند دیکتاتۆرێک وەک پێغەمبەران دەناسێنن. ئەم دیکتاتۆرانە ئیسلام و قورئان لە ناو دەبەن. لە بانە بۆمبێکی تەوقیت دەتەقێتەوە، ئەوان لە قوم دەڵێن کە کۆمەڵێک شاخستانی، کۆمەڵێک یاغی بە هەڵەشەیی خۆیان بە کوشت دەدەن".

مەلاکە هاواری کرد:

"لێرەوە بانگەواز ئاڕاستەی قوم و تاران دەکەم، گوێتان لێ بێت، دیسان بە هەڵە بۆمبە تەوقیتەکانمان دەتەقنەوە، دیسان بە نەزانی خۆمان بە کوشت دەدەین، بەڵام بۆمبە تەوقیتەکەمان بۆ ئەو کاتژمێرە قورمیش دەکەین کە پێویستمان بێت".

لاوەکان هاواری ستایشیان بەرز بووەوە.

دوای تەواوبوونی قسەکانی پیاوە ئایینییەکە لەگەڵ لاوەکان بەرەو ماڵی ئەو شەهیدە چووین کە پرسەیەکیان بۆ ساز کردبوو. کات

لە نیوەی شـەو لای دابـوو. هەموومان بە ئەسپایی ڕێمان دەکرد تا دواجار گەیشتینە ماڵی تێکۆشەرێکی کورد، کوردێک کە ژیانی بە خەبات لە پێناوی ئازادیدا تێپەڕاندبوو. ماڵێکی سـادە بـوو، بـاوکـی، جووتیارێکی هـەژار بوو کە ساڵانێکی زۆر لە مەوپێش مردبوو. ئەو شەهیدە کوردە سەرپەرشتی دایک و خوشک و براکانی بە ئەستۆ گرتبوو تا ئەو کاتەی گەورە ببوون. ئێستا خوشک و بـرا لە بـەر دەرگـەن و خەریکی شین و ڕۆڕۆن. خوشکەکان سروودێکی کوردییان دەخوێند. براکان بە کوردی هەندێک شتیان دەگوت:

"ئـەو زیـنـدووە. شـۆڕشـگـێڕ زیـنـدوون. ئـەوانـەی پشت و پـەنـای زەحمەتکێشانن، هەرگیز نامرن".

دەنگی بـراکـان لە حـەوشـەکـەدا زایەڵەی دەدایەوە:

"بژی هاوڕێی زەحمەتکێشان، بژی پشت و پەنای جووتیاران".

هەرگیز نەمبینیبوو لە پرسەی مەرگی ئازیزێک باس لە گەلان و ئازادی بکرێت. ئەو شەوە، لەو ماڵە بچووک و ئەنگوستەچاوەدا، لەو ماڵەی لاوانی بانەیی شینیان دەگێڕا، خوشک و براکانی هاوڕێی شەهیدەکە باسی گەلان و گەلی کوردیان دەکرد، باسی نان و زەوی و زاریان دەکرد، باسی دابەشکردنی ئازارەکان. ئەو شەوە لەگەڵ لاوانی بانەیی چەندین سەعات فرمێسکم هەڵوەراند.

### نووسینگەی کۆمەڵەی تێکۆشەرانی ئازادی و دەستەبەرکردنی مافی گەلی کورد

ڕۆژی دواتر کە لە ماڵی ئەو هاوڕێیە هاتینە دەرێ، سەرێکمان لە دەفتەری نووسینگە دا. لاوەکان وەک هەمیشە لەوێ بوون و بە کاروبارەکان ڕادەگەیشتن. نووسینگەی کۆمەڵە جمەی دەهات. دێهاتییەکان دەهاتن، کێشەکانیان دەهێنایە گۆڕێ و داوای چارەسەریان لە لاوەکان دەکرد. لاوەکانیش پۆل پۆل دادەنیشتن و گیروگرفتەکانیان

تـاوتـوێ دەکـــرد، لـە ڕوانـگــەی جـیـاوازە هەڵیاندەسەنگاند و دواجار سەرەداوەکەیان دەدۆزیـــیـــەوە، دەیـانـخـسـتـە بـەر دەسـتـی وەرزێرەکە و دەیانناردەوە دێ.

کە لەوێ دانیشتبووم و خەریکی قسەکردن بـووم لـەگـەڵ ئـەوانـی تـر، کرێکارێکی چرچ وەژوور کـەوت، یەکسەر سۆراغی دکتۆری کرد، تووڕە بوو. دکتۆر کوڕەکانی بانگ کرد بۆ ئەوەی زوو کۆببنەوە و بزانن ئەم هاوڕێ کرێکارە دەڵێت چی. کـوڕەکـان لـە دەوری مێز کۆبوونەوە. گشتیان لە کرێکارەکە کەم تەمەنتر بوون. دکتۆر پێی گوتم:

"لە کوردستان پرسی سەرەکیی ئەوەیە کرێکار و وەرزێر متمانەیان بە ڕۆشنبیر[3] هەیە. ئەوان پێیان وایە تەنانەت ئەم لاوانە دەتوانن کێشەکانیان چارەسەر بکەن. دەسبەجێ پاڵ وە ڕۆشنبیران دەدەن. بڕوایان وایە ڕۆشنبیر لایـەنـی ئـەوان دەگـرێـت، لـەو ڕۆژەوەی لە

3 ڕەنگە پێویست بکات بڵێم ئەو «ڕۆشنبیر»ەی دکتۆر مەبەستیتی، جیاوازە لەو ڕۆشنبیرە تارانی و ...ەی لە پشت مێز دادەنیشێت.

هەندێک مەسەلەی سیاسیی گەیشتوون، زیاتر بەرەو لامان دێن، نارەزایەتییەکانیان زیاتر بووە و پرسی پتر دێننە گۆڕێ، بەڵام کێشەیەکی گەورە هەیە، ئەویش ئەوەیە کە کرێکارەکان لە هۆکاری پەیوەندیی لەگەڵ خەڵکی دێ ناگەن، بە لایانەوە ئەستەمە وەرزێرێک بە پشتیوانی خۆیان بزانن. بەڵام کوڕەکان بێ ڕاوەستان کار دەکەن و پێیان وایە ئەم پرسگرێکە چارەسەر دەبێت".

ئەو کرێکارەی بە تووڕەییەوە هاتبووە ژوورێ، کاتێک لاوەکان لە دەوری کۆبوونەوە و قسەیان لەگەڵ کرد، ئارام بووەوە. لاوەکان بەشێک لە قسەکانیانی بۆ وەرگێڕام و بۆیان باس کردم چما تووڕەیە. دەیگوت:

"هێندە پەرش و بڵاو نەبن. ئەم هێزە پێشکەوتووخوازانە دەبێت یەک بگرن. چ سوودێکی هەیە یەکێک لێرە دامودەزگایەک بکاتەوە و یەکێکی تر لەوێ. کۆمەڵێک کرێکار بێنە ئێرە و کۆمەڵێکی تریش بچنە ئەولا. ئاوا بێ کەڵکە. دەبێت ئەم حیزب و هێزانە لە

کوردستان یەک بگرن. بۆ تێ ناگەن خەریکە سوپا بۆ تێکشکاندنی ئێمە ئامادە دەکەن. تو خوا پەلە بکەن، درەنگ دەبێت، زوو بن یەک بگرن".

کرێکارەکە مستێک لە مێزەکەی بەردەمی دەدات و دەڵێت:

"درەنگ دەبێت. هیچ کەس پشتیوانی لەگەڵی کورد ناکات. ئێمە دەبێت خۆمان لە فیکری خۆمان دابین".

ئەوجا سیمای ڕواڵەتی کرووزانەوە بە خۆیەوە دەگرێت. کرێکاری کوورەخانەیە.

ئێستا وەرن با ڕێکخراوەکان باشتر بناسین. ئێستا کە ئەم کرێکاری کوورەخانەیە دەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی هێزەکان یەک بگرن، منیش ئەم هەلە دەقۆزمەوە بۆ ئەوەی بڵێم تا ئێرە ئێمە چوار حیزب، یان ڕێکخراومان ناسیوە و لە مەوبەدوا زیاتریش لەگەڵیان ئاشنا دەبین.

یەکیان هەمان حیزبی دیموکراتی کوردستانە کە لە سەردەمی قازی

محەممەدەوە لە دڵی کوردەکاندا ماوەتەوە
بەڵام لاوە خوێندەوارەکان ئامادە نین وەکو
باوکیان بە چاوبەستراوی دوای ئەم حیزبە
بکەون. هەر دەرفەتێک بێتە گۆڕێ، شتی بز
بەرەی ڕێبەرەکانی دەخەنە سەر بەرەوە و
خیانەتەکانیان لە قاو دەدەن و هەوڵ دەدەن
ئەم حیزبە ڕیفۆرمخوازە کە گرووپێک ئاغا و
وردەبۆرژوا ڕیبەرایەتیی دەکەن، لە سەر هێڵ
لا بدەن، هەڵبەت کارێکی تا بڵێی دژوارە.

ڕێکخراوەکەی تر، ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی
زەحمەتکێشانی کوردستانە کە تا ڕادەیەک
قسەمان لە سەر کردوە، بەڵام بە هۆی
ئەوەی ئەم ڕێکخراوە لە دەرەوەی کوردستان
بە گوێرەی پێویست نەناسراوە، دەبێت
شیکردنەوەی زیاتر لەم بارەیەوە بدەم.

ئەم ڕێکخراوە نووسینگەیەکی ئاشکرا
و دیاریکراوی نییە. زۆربەی ئەندامەکانی
لە گوندەکانن و شان بە شانی جووتیاران
کار دەکەن. ڕواڵەتی دێهاتییان هەیە و
ڕەنگە ماوەیەکی زۆر لە گوندەوە نەیەن بۆ

شار (ژمارەیەک لە ئەندام و لایەنگرانی ئەم ڕێکخراوە، بە شێوەیەکی ئاشکرا، هەڵبەت نەک بە ناوی ڕێکخراوەوە بەڵکو وەک کەسێکی سەربەخۆ، لە نووسینگەکانی "کۆمەڵەی تێکۆشەرانی ڕێگەی ئازادی و دەستەبەرکردنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد" چالاکن و بە کاروبارە سیاسی و سەربازییەکانی شار و گوند ڕادەگەن.)

ئەم دواییانە (نێوەڕاستەکانی مانگی گەلاوێژ) لە گوندێکی دەوروبەری سەردەشت، ڕێکخراوەکە خەباتی خۆی ئاشکرا کرد و بنکەیەکی بچووکی بە ناوی "ڕێکخراوی شۆڕشگێڕیی زەحمەتکێشانی کوردستان" لە هەمان دێ دامەزراندووە.

زۆر کەس ئەم حیزبە بە ماویست دەزانن، چونکە ئەندام و لایەنگرانی ئەم ڕێکخراوە زیاتر لە گوندەکان کار دەکەن، بەڵام ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە بە بیستنی ئەم نازناوە هاواریان لێ بەرز دەبێتەوە و دەڵێن ئێمە ماویست نین، ئێمە لەگەڵ کرێکارەکانیش پەیوەندیمان باشە.

لێ دۆخی ئێستای کوردستان وا دەخوازێت گرنگییەکی زیاتر بە جووتیاران بدەین. ئەوان دەڵێن ئێمە بۆیە دەچینە ناو جووتیارانەوە بۆ ئەوەی تێگەیشتنی سیاسییان بەرینە سەر، ناخی چەپەڵی ئاغا و دەوڵەت و ئیمپریالیزمیان پێ بناسێنین. ئەوان دەپرسن ئاخۆ ئەو جووتیارەی باشتر لە شتەکان تێ دەگات، سەرەدەر لە ئاغا دەردەکات، ئیمپریالیزم و دەوڵەتە ئەڵقە لە گوێیەکەی دەناسێت، چاکتر ناتوانێت پشتیوانی لە کرێکار بکات و ئاگای لێ بێت؟ ئاخۆ ڕەوایە ئەو کوردستانەی ٨٠%ی دانیشتوانی جووتیارن، پشتگوێ بخەین و سەرنجمان تەنیا لە ناوچە پیشەییەکان بێت؟

ئەوان پاش هێنانە گۆڕی ئەم پرسیارە، بەر لە وەی کەسێک فکرێکی لاڕێ بکاتەوە، یەکسەر جەخت دەکەنەوە کە: "هەڵبەت کارکردن لە ناوچە پیشەییەکان زۆر پێویستە".

ئەم ڕێکخراوە پێی وایە تاکە ڕێگەی ڕزگاریی گەلانی زوڵملێکراو، خەباتی چەکداری درێژخایەنی جەماوەرییە بە ڕێبەرایەتی حیزبی پێشەنگی چینی کرێکار.

له ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە دەتوانین ئاماژە بە شەهید سەعید موعینی ناسراو بە "خانە" و شەهید حەمە حوسێنی کەریمی ناسراو بە "وەستا ساڵح" بکەین.

ڕێکخراوەکەی تر، ڕێکخراوی پارتیزانە فیداییەکانی گەلی ئێرانە کە لە بارەیانەوە بە تێر و تەسەلی قسە دەکەین. بەس دەبێت بڵێم ئەم ڕێکخراوە، لە ڕێگەی لایەنگرانییەوە، لە سەردەمی شۆڕشەوە تا ئێستا کە مانگی گەلاوێژی 58ی زاینییە و دەوڵەت لە بیانوویەک دەگەڕێت بۆ ئەوەی ئێستا نا ئێستا پەلاماری کوردستان بدات، توانیویەتی بە باشترین شێوە لە کوردستان بجووڵێتەوە (هەم لە ڕوانگەی سیاسیی و هەم لە ڕوانگەی سەربازییەوە) و لە دڵی خەڵکدا جێی خۆی بکاتەوە. لایەنگرانی ئەم ڕێکخراوە لە سنە و بە تایبەتی لە مەهاباد شێلگیرانە کار دەکەن و نەبزی کوردستانیان لە دەست دایە. ئەوان لە هەر شوێنێک شەڕ و پێکدادان بێتە ئاراوە، خێرا بارودۆخەکە

هەڵدەسەنگێنن و دەکەونە خۆ. ئەگەر پێویست بکات شان بە شانی خەڵکی دێ چەک هەڵدەگرن و شەڕی دوژمن دەکەن و هەر لەوێش خەڵکی دێهاتەکان لە ڕووی سیاسییەوە پەروەردە دەکەن. دیارە بە گشتی ئەندامانی ڕێکخراوی شۆڕشگێڕیی زەحمەتکێشانی کوردستان لە ڕێزی پێشەوەی بەرە بەدی دەکرێن. خەڵکی دێ، لایەنگرانی پارتیزانەکان بە داس و چەکوچ دەناسنەوە. کاتێک لە پێشمەرگەیەکی حیزبی دیموکراتم پرسی کام ڕێکخراوت خۆش دەوێت، بە شانازییەوە گوتی:

"من ئەندامی حیزبی دیموکراتم".

گوتم دەزانم، بەڵام بێجگە لە حیزبی دیموکرات کامیانت خۆش دەوێت. چاوێکی بە دەوروبەردا خشاند و کاتێک دڵنیابوو کەسی لێ نییە، گوتی:

"پارتیزانەکانم زۆر خۆشدەوێت، ڕێکخراوی شۆڕشگێڕیی زەحمەتکێشانیشم زۆر خۆشدەوێت".

ئەمنیش دەمزانی کە ئەو حیزبی دیموکراتیشی زۆر خۆشدەویت.

بە گشتی خەڵکی ڕەمەکی حیزبی دیموکراتیان زۆر خۆشدەویت، ئەوان هەروەها ڕێکخراوی شۆڕشگێڕیی زەحمەتکێشانی کوردستان و پارتیزانەکانیشیان زۆر خۆش گەرەکە.

بۆ ڕێکخراوێکی وەک پارتیزانە فیداییەکانی گەلی ئێران فرە بە نرخە کە دیموکراتییەکی ڕەمەکیی زۆری خۆش بوویت. ئەویش لە کاتێکدا کە ڕێبەرانی حزب چارەی پارتیزانەکانیان ناویت، بە منداڵە ورکەیان دەزانن و هەتا نەبنە ملۆزم، کاریان بە کاری وان نەداوە. یەکێک لە بەرپرسە قسە ڕۆیشتووەکانی حیزب دەیگوت ئەگەر زۆر بلحەڕوویی بکەن، دەیانسرپینەوە. هەڵبەت ئەوە قسەیەکی پووچە کە پیرەمێردێکی پاوانخواز دەتوانێت لە جێی گەرم بیکات، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ڕێکخراوی پارتیزانە فیداییەکانی گەلی ئێران هێشتا نەبووەتە ملۆزمی حیزبی دیموکرات.

ڕێکخراوەکەی تر، کە نازانم دەتوانی پێی بڵێی ڕێکخراو، یان نا، بریتییە لە یەکێتییە جووتیارەکان کە ئەوانیشمان لە سەرەوە ناسی.

دەمێنێتەوە ڕێکخراوێک ئەویش کۆمەڵەی "تێکۆشەرانی ڕێگەی ئازادی و دەستەبەرکردنی مافی نەتەوەیی گەلی کورد"ە کە بە کۆمەڵە بەناوبانگە. ئەم ڕێکخراوە لە سەروبەندی شۆڕشدا چێ دەبێت، لە هەموو شارەکانی کوردستان نووسینگەی هەیە و پەیڕەونامەیەکی دیاریکراوی نییە. بەڵام سەرجەم هێزە پێشکەوتووخوازەکان بە هەر ئایدیۆلۆژیایەکەوە دەتوانن کاری تێدا بکەن. (هەڵبەت جگە لە لایەنگرانی تودە و حیزبی دیموکرات و ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی کە بڵاوکراوەیەکی هەیە بە ناوی ڕەنجبەر.) زۆربەی هەرە زۆری ئەندامە چالاکەکانی ئەو لاوانەن کە چەندین ساڵ زیندانیان چێشتووە. دەکرێت بڵێین هەندێک لە ئەندامانی ڕێکخراوی شۆڕشگێڕیی زەحمەتکێشانی کوردستان نەک وەک ڕێکخراو، بەڵکو وەک کەسی سەربەخۆ ڕۆڵی چالاکیان لەم

کۆمەڵەیەدا هەیە. پێشتر لایەنگرانی ڕێکخراوی پارتیزانە فیداییەکانی گەل لەم کۆمەڵەیەدا شان بە شانی ئەوانی تر چالاکییان هەبوو، بەڵام کاتێک ڕێکخراوی پارتیزانەکان لە کوردستان پەرەی سەند، لایەنگرەکانی کۆکردەوە و بەرەو خۆی ڕایکێشان. ئەوکات لایەنگرانی ڕێکخراو لەم کۆمەڵەیە هاتنە دەرێ. ڕێکخراوی پەیکار بە حوکمی ئەوەی لە کوردستان نووسینگەی نەبوو، ئەم هەلەی قۆستەوە و لایەنگرانی بەرەو ئەم کۆمەڵەیە هان دا. ئێستا ڕێکخراوی پەیکار و ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان و ڕێکخراوی تری وەک یەکێتیی کۆمۆنیستەکان و حیزبی کرێکارانی سۆسیالیست و... ماونەتەوە و لە بەر ئەوەی ڕێکخراوی پەیکار لە ڕوانگەی تیۆرییەوە لە ڕێکخراوەکانی دیکە بەهێزترە، ئەگەر هەروا بەردەوام بێت، پێشبینی دەکرێت لە داهاتوودا ڕێبەرایەتی "کۆمەڵەی تێکۆشەرانی ڕێگەی ئازادی و دەستەبەرکردنی مافی نەتەوەیی گەلی کورد" بەدەستەوە بگرێت.

## بیرهێنانەوەیەکی بێ سوود

ئێستا کە ڕێکخراوەکانمان ناسی، دەبێت بڵێم کە هەر کام لەم ڕێکخراوانە ژمارەیەک پێشمەرگەی هەیە و ئەگەر لە هەر شوێنێکی کوردستان شەڕ و پێکدادان ڕوویدات، بە پێی شیکردنەوەیەک کە هەر ڕێکخراوە و لەو پێکدادانە هەیەتی، ئەگەر بە پێویستی بزانێت لە چاوتروکانێکدا پێشمەرگەکانی دەنێرێتە شوێنی پێکدادانەکە و ئیشی ئەم پێشمەرگانە

بە پێی ئەو شیکردنەوەیەی لە شەڕەکە کراوە، لە دوو حاڵەت بەدەر نییە: یان دەبێت بڕۆن و لە بەرژەوەندی خەڵک شەڕ بکەن کە شەڕ دەکەن، یان ئەوەتا ئەم پێکدادانە لە قازانجی گەلی کورد نییە و دەبێت بڕۆن و پێشی پێ بگرن، بۆیەش هەوڵ دەدەن پێشی پێ بگرن.

لێرەدایە ڕێکخراوێک بە چۆنیەتی تێڕوانین و هەڵسەنگاندنەکانی دەتوانێت لە نێو دڵی خەڵکیدا جێ بکاتەوە، یان لەبەر چاویان بکەوێت. ڕێکخراوی پارتیزانە فیداییەکانی گەلی ئێران تا ئێستا لە نێو دڵان دابووە، بەڵام حیزبی دیموکرات لە پێکدادانەکانی ...... ..... زیاتر لایەنی ئاغاکانی گرتووە. کۆمەڵە و ڕێکخراوی شۆڕشگێڕێی زەحمەتکێشان هەل و ئیمکانی ڕێکخراوی پارتیزانەکانیان نییە.

### دەبێت بچیتە کوردستان و بە چاوی خۆت ببینی

هەموو شتێک لەوێ جیاوازە، لێرە چەک شتێکی ئاساییە. تەقینەوەی بۆمبێک وەک شکانی شووشەیەک وایە. ئەگەر تەنانەت نۆ کەس بکوژرێن، بەو مەرجەی نەتەوێت دەستی

دەوڵەتی تێکەڵاو بکەیت، زوو بێدەنگەی لێ دەکرێت و لە بیردەچێتەوە.

لە تاران، شیراز، ئیسفەهان و قوم پیرەمێردێک دوای تەمەنێک کار، هیچ نەبێت دەتوانێت خانەنشین بێت و لە ماڵێ پاڵ بداتەوە، دەفتەری بیرەوەرییەکانی هەڵبداتەوە، یان خەریکی دەوا و دەرمان و چوونە دکتۆر بێت، یان ئەوپەڕی بە قاڵییەک بکاتەوە و بنیشت بفرۆشێت. لێ لە کوردستان پیرەمێردەکان دەبینی لە بری گۆچان، بڕنەوێکی درێژیان لە شان کردووە و لە بری ئەوەی پشتێنێک لە نێو قەدی بهاڵێنێت و خۆی گەرم ڕابگرێت، ڕیزێک فیشەکی بەستووە و ڕەپ و ڕاست و بە هەنگاوی پتەو بە نێو شاردا ڕێ دەکات. لە کوردستان هەموو شتێک بە شێوەیەکی دیکەیە. دەبێت کوردێک لە مەزراکەی ببینیت، ژنانی کورد بۆ دروێنەی گەنم، خەرمان هەڵگرتن و عەمبارکردن شان بە شانی پیاوان کار دەکەن. ئەوان داوێنە شۆڕەکانیان

دەخەنە نێو شەڵوارە فشەکانیان. لە بەیانییەوە تا ئێوارە دادێنەوە و چەشنی مریشک چڵ بە چڵ بژارێ دەکەن، یان دەنا گەنم دەدروونەوە. ژنی کورد زیاتر لە ژنانی دیکە کار دەکات. ئەو، بەو شێوەیەی لە شار، یان لە دێهاتەکانی تر هەیە، بەدی ناکرێت، ناتوانی بڵێیت لەبەر کارکردنی لە ڕادەبەدەر چی لێ دێت. سەرجەم ئەو پێناسە و دیمەنانەی سەبارەت بە ژنی کورد هەمانە، بە بینینی ژنێکی کوردی خەڵکی گوند لە بەر یەک هەڵدەوەشێنەوە. ئەو بوونەوەرێکی ترە. دەبێت لە مەزرا، لە کاتی دروێنە، لە کاتی دەسکەنەی نۆک و ڕنینی گەڵای تووتن، لە کاتی بە کۆڵدادانی تەلیسە گەنم و لە کاتی ڕەنج چێشتندا ببینیت. بەم جۆرەیە ژنی کورد وەک مێردەکەی باسی خودموختاری دەکات و ئازادیی خۆی دەوێت. منداڵ لە دێهاتەکانی کوردستان، هەر لەگەڵ ئەوەی دێنە دونیا، کەس دەرفەتی نییە سەرنجیان

پێ بدات و ئەوان لە مەزراكان بۆ خۆیان بە شێوەیەكی سروشتی گەورە دەبن و بە حاڵەحاڵ خۆیان دەناسن كە ئیشكردن لە مەزرا دەست پێ دەكات و بەردەوام دەبێت تا ئەو ڕۆژەی بۆی دەردەكەوێت سەری سپی بووە. ئەو كوردێكە و جووتیارێكە و خودموختاری گەرەكە.

**لە خانێكی سەرسنوورەوە دەچینە پیرانشار**

كە لە كورەكان دادەبڕام و دەمویست درێژە بە ڕێگەكەم بدەم، دكتۆر گوتی:

"ڕاوەستە، چەند كەسێك لە هاوڕێیان دەچنە خانێ. بە ئۆتۆمبێلەكەی ئەوان بڕۆ".

ئۆتۆمبێلەكە ئامادە بوو، كەوتینە ڕێ. لە كاتی ماڵئاواییدا دكتۆر توند دەستی گوشیم و گوتی:

"ئێمە چاوەڕوانیمان هەس، ئێمە چاوەڕوانیی زۆرمان لە گەلانی تر هەیە".

ئۆتۆمبێلەكە كەوتە ڕێ. دكتۆر بە پەرۆش بوو، باش هەستم بە مە دەكرد.

که له هێڵی سنووری بانەوە بەرەو سەردەشت و پیرانشار دەچی، له هەموو شوێنێک تێکۆشانی پێداگر و تاقەت پڕوکێنی پیاوان و ژنانی کورد دەبینی که له مەزراکان سەرقاڵی کارن. جادەی سەر سنوور وەک شریتێک له تەپۆڵکەکان دەهاڵێت و دەگاتە نێو قووڵایی دۆڵەکان. له دۆڵەوە تێ هەڵدەبێت و پێ به پێی چۆمێک بەردەوام دەبێت که کوردستان دەبڕێت. به پێدەشتە زەرد و سوور و قاوەیی و کەسکەکاندا تێپەڕ دەبێت، به دەوری کانییە ئاوەکاندا دەسووڕێتەوە، ئەو ڕەزانە له پاش خۆی بەجێ دێڵێت که هێدی هێدی دەردەکەون و ئەوسا دەگاتە سەردەشت، پیرانشار و مەهاباد و ورمێ. به پێی ئەو نەخشەیەی دەوڵەتە بەکرێ گیراوەکان له سەردەمی محەممەد ڕەزا شادا کێشاویانەتەوە، کوردستانی ئێرانیشیان لەتوپەت کردووە. پاش ئەوەی چەند کیلۆمەترێک له بانە دووردەکەویتەوە، به ڕواڵەت کوردستان تەواو دەبێت و پێ دەنێیتە ئازەربایجانی ڕۆژئاواوە. ئەو شوێنەی

هەر ئەو کوردانە بە هەمان فەرهەنگ و دەسەڵاتەوە داوای خودموختاری دەکەن و ئامادە نین هەنگاوێک پاشەکشە بکەن. کە لە بانە دووردەکەوینەوە، بەرەو ئەو ناوچانە دەچین کە مەکۆی خەباتگێڕانی وەک مەلا ئاوارەکان و شەریفزادەکان و موعینییەکان و... بووە. خەباتی جەماوەری کورد زیاتر لەم ناوچانە بووە.

لە بانەوە بەرەو سەردەشت جوگرافیای دەوروبەر هەندێک دەگۆڕدرێت. لە سەر ڕێگەت بەردەوام چاوت بە ڕەزی ترێ دەکەوێت. لە کاتێکدا لە قەراغ جادەکانی پێشوو وەها شتێک نەدەبینرا. گەلە بزن و ڕانە مەڕ و گاڕان مەودا مەودا لە لەوەڕگەکان، لەسەر تەپۆڵکەکان و لە نێوەڕاستی جادەکان بەدی دەکرێن. لە کاتێکدا لەسەر ڕێگەکانی پێشوو ئەم دیمەنانەت نەدەبینی. لێرە، دەشتەکان جوانتر دەنوێنن. گەنم جاڕەکان وەک کۆمەڵێک پارچەی زێڕین کە بە دەشتەکانەوە پینە کرابن، لە تەنیشت کێڵگەکانی توتن بەدی دەکرێن. سەرچاوەکانی

ئاو زیاترن و هەتا پتر دەچیتە پێش، زیاتر ڕووبـــەڕووی ئـەو پیـاو و ژن و منداڵانـە دەبیتەوە کە نـەک هـەر ناتوانن بە فارسی قسە بکەن، بەڵکو وای لێ دێت بۆ تێگەیاندنی مـەبـەسـتـەکـەت، یـان پرسینی ئـەدرەسـێک دەبێت کەڵک لە دەستت وەربگری، یان هەوڵ بدەی بە ئاماژە مەبەستەکەت بگەیەنی. لەو دەوروبەرانە، بێگانە بە دەگمەن دەبینرێت. بۆیە ئەگەر ڕۆژێک لەو مەزرایانە، یان لە لێواری ئەو کانییانە، یان لە قەراغ مێوستانەکان، وەک ئـەو کوڕێژگە بانەییە دەیـگـوت کەسێک بە پانتۆلی قایشدار بە دەرکەوت، وەک چەقڵێک لـە چـاوی دەشـت ڕۆ دەچـێت و سەرنجی هەمووان ڕادەکێشێت. خەڵکانی ئێرە کەمتر ڕێـیـان کـەوتـووەتـە شـار، ئۆتۆمبێل و پاس کەمتر لەسەر ڕێگەکان دەبینرێن. هەتا زیاتر لە شارێک دوردەکەوێتەوە، ئەم خەسڵەتە پتر خۆ دەنوێنێت. بە دەم ڕێوە، کوڕێکی تەمەن دە دوانزە ساڵ لە نێوەڕاستی جادەکە ڕاوەستا، بە ئـامـاژە داوای کـرد ڕایگرین، ڕامانگرت،

هاتە پێشێ، بە کوردی هەندێک شتی گوت و ئاماژەی بە تەپۆڵکەکان کرد، لە مەبەستی تێ نەگەیشتین، نەمانزانی دەڵێت چی، هەمدیس هەوڵی دا، کاتێک نەیتوانی مەبەستەکەی بگەیەنێت، چاوە بریقەدار و ڕووخسارە تاوە سووتەکەی ڕواڵەتێکی خەماوییان بە خۆوە گرت و دواجار هاواری کرد:

"فارسی بەلەد، نا، نیست".

هەرچی بێ سواری ئۆتۆمبێلەکەمان کرد و دواجار تێگەیشتین کە دەڵێت:

"لە بری ئەوەی بە پێیان بڕۆم، دەتوانم لەگەڵ ئێوە سواری ئۆتۆمبێل بم. هەتا بن تەپۆڵکەکەی ئەولام بەرن کە نزیک سنوورە. پەزەکانمان لەوێ دەلەوەڕێن. دەتوانم بە پێیان بڕۆم، بەڵام هەتا ئەوێم دەبەن؟"

ناوی ڕەسووڵ بوو. نەیدەزانی دونیا چ باسە. دونیا هەر ئەم جادەیە بوو ئەم بەندەن و پەز و کانییاوانە و خەڵکی دێ، ڕەنگە ئەو ئۆتۆمبێلانەش کە تێدەپەڕین و ئەو بێگانانەی جار و بار ڕێیان دەکەوتە ئێرە و نەدەوەستان و

یەکسەر دەڕۆیشتن. بە ئاماژە هەندێک شتمان لە ڕەسووڵ پرسی. ئەو هەر پێدەکەنی و بەس بە وشەیەک و بە وشەیەکی عارەبی خەست و خۆڵ وەڵامی دەدایەوە:

- ڕەسووڵ چوویتە سەقز؟
- ناوەڵڵا.
- ڕەسووڵ چوویتە بانە؟
- ناوەڵڵا.
- ڕەسووڵ چوویتە ئەودیو سنوور؟
- ناوەڵڵا.
- ڕەسووڵ ناوی تارانت بیستووە؟
- ناوەڵڵا.
- ڕەسووڵ خوێندەواریت هەیە؟
- ناوەڵڵا.

لە داوێنی تەپۆڵکەیەک کە ڕانە مەڕێک دەلەوەڕا، ڕەسووڵ تێی گەیاندین ئۆتۆمبێلەکە ڕاگرین بۆ ئەوەی دابەزێت. هەر چەند هەموو هۆش و زەینمان لەسەر ئەوە بوو دەرگاکە بەر دەستی نەکەوێت، بەڵام نووکی پەنجەی لەنێو دەرگاکەدا مایەوە و ئازار لە ڕووخساریدا

بەدی کرا. خەفەت دایگرتین، نەماندەویست دڵخۆشییەکەی بەم جۆرە کۆتایی بێت. قامکی خستە بن هەنگڵی و لە بەر ژانی زۆر ددانەکانی لە چیرەوەبردن:

- ڕەسووڵ ئێشی زۆرە؟
- ناوەڵڵا.

لە ڕەسووڵ دوورکەوتینەوە و بەرەو سەردەشت درێژەمان بە ڕێگەکەمان دا.

### دەوڵەت دەیەوێت دیسان ژەندەرمەکان بێنێتەوە

ڕژێمی بەکرێگیراوی محەممەد ڕەزا شا، بۆ هەر سێ چوار ماڵێک بنکەیەکی سەربازی قووت کردبووەوە، کە لە داوێنی گردێک، لە قەراغ کانییەک، یان لە گۆڕاییەک دروستکرابن و ناوی گوندیان لێ نرابێت. چەند ئۆتۆمبێلێک و چەند ملهوڕێک بۆ ئەم بنکانە تەرخان کراون کە لە تەڕی خواردویانە، لە وشکی بۆی نووستوون و ورگیان زل کردووە. مووچەیەکی بایی خوێنی باوکیانی بۆ بڕیونەتەوە، بەس بۆ ئەوەی هەر کوردێک ویستی لە جێی خۆی

بجووڵێتەوە و سەری بەرزکردەوە، قۆنداغە تفەنگێکی لە تەپڵی سەری بدەن و مێشکی بپژێنن. ڕژێمی فاشیستی محەممەد ڕەزا شا ژمارەیەک تاوانباری بە ناوی ژەندەرمە لە هەموو شوێنێکی ناوچەکە جێگیر کردووە. ئەم پیاوکوژانە پاکترین و خەباتگێڕترین ڕۆڵەکانی کوردیان خەڵتانی خاک و خوێن کردووە. ئەگەر کوردێک دەیەوێت خۆی پارێزگاری لە ناوچەکەی خۆی بکات، خۆی چاوی بە سەر دەشتەکانی وڵاتەکەیەوە بێت، خۆی دەیەوێت نیگابانی سنوورەکانی بێت، لەبەر ئەوەیە هیچ نەبێتت ئەم بەرەڵڵا ئەجنەبییانە، ئەم ژەندەرمانەی وەک مەرگ سێبەریان خستووەتە سەر خەڵکی دێ، لە تاکی کورد دووربکەنەوە. وەک دەبینین هەر لەگەڵ ئەوەی خەبات دەستی پێکرد، کوردەکان بەر لە هەموو شتێک، پەلاماری بنکەکان دەدەن. ژەندەرمەکان دەزانن چ تاوانگەلێکیان ئەنجام داوە، چییان بە سەر شەرەفی خەڵکی هێناوە، بۆیەش هەر کە دۆخەکە دەشڵەژێت،

وەک کرمی گڵی لەنێو قوڕ و لیتاودا خۆیان حەشار دەدەن. وێڕای ئەمەش، دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی پێداگرە ژەندەرمەکان دیسان بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکە.

ئەمریکای ئەرباب پێویستی بە ژەندەرمەکانە، کوردەکان دەبێت کپ بکرێن، دەبێت نەمامی خەبات و ئازادییان بە پۆستاڵی ژەندەرمەکان پێشێل بکرێت. بۆیەشە گەلی کورد هاوار دەکات و دەڵێت ژەندەرمەکانی ناوێت و دەوڵەتی کۆماری ئیسلامیش هەر لەبەر ئەمەیە پێداگری دەکات ژەندەرمەکان لە ناوچەکە بمێننەوە.

کوردەکان، ئێستا لە سەرانسەری ناوچەکە، دەستیان بەسەر بنکە سەربازییەکان داگرتووە و ژەندەرمەکانیان لە کوردستان ڕاو ناوە. چەک و ئۆتۆمبێل و کەرەستەکانی ئەوانیان بە غەنیمەت گرتووە و بە شانازییەوە لە سنوورەکان و دەشتەکان ئێشک دەگرن. لەگەڵ ئەوەشدا ڕادیۆی ئیستیعمار بەردەوام دەقیرێنێت کە کوردە جیاخوازەکان وڵاتیان

خستووەتە مەترسییەوە و دەیانەوێت کوردستانی ئازیز لە نیشتیمانمان دابڕن. جا بۆ ئەوەی کوردستانی ئازیز لە نیشتیمان دانەبڕدرێت، بە ناوی ئیسلام و قورئانەوە، هەندێک ڕووت و ڕەجاڵ وەک پاسدار و قیادەی موەقەت دەدەنە پێش و لە گیانی کوردەکانیان بەردەدەن. کوردەکان هاواریان لێ بەرز دەبێتەوە و دەڵێن:

"بۆچی ناهێڵن خۆمان، بەڵێ خۆمان، لە ناو خۆماندا خەڵک بکەینە ئێشکگر. بۆ ئێوە ژەندەرمەتان ناوێت؟ وەرن با ئەو ژەندەرمانە لە نێو خۆماندا هەڵبژێرین. خۆ ئێمە مرۆڤی نەخوێندەوارمان زۆرە".

کەس گوێی بەم قسانە نابزوێت، دەوڵەت لە تارانەوە پاسدار دەنێرێت. لاوی چارەڕەش، بێکار و برسی بە ناوی ئیسلام و کۆماری ئیسلامییەوە پێ دەنێنە ناوچەکەوە، بێ ئەوەی تۆسقاڵێک زانیارییان سەبارەت بە کورد و کوردستان هەبێت. ئەربابیش چاوەڕوانە شەڕ و پێکدادان ڕوو بدات. دەیەوێت پزیسکێک

دروســت بێت تـاوەکو سوپا وەفـادارەکـەی بخزێنێتە ناوچەکەوە. خۆبواردن لە پێکدادان مەحاڵە، ئەرباب وای گەرەکە.

**شەو دەگەینە پیرانشار**

سەعات دەی شــەو گەیشتینە پیرانشار (خانێ). لە بـەردەم قاوەخانەیەک ڕامانگرت. کـوردێـک ئـەگـەر بێگانەیەک ببینێ و پێی وابێت مرۆڤێکی خراو نییە، دەستبەجێ باس و خواست لەگەڵ دادەمەزرێنێت، ئیتر تۆ بۆ بـە قسەهێنانی کێشەیەکی ئـەوتـۆت نابێت. کە چووینە نـاو قاوەخانەکەوە، تەلەڤزیۆن داگیرسابوو، خۆپیشاندانی ڕۆژی سێشەممەی "ڕێپێوانی یەکێتی"ی نیشان دەدا.

قــاوەچــی بــە تــەوســەوە ئــامــاژەی بە تەلەڤزیۆنەکە کرد و گوتی:

"بـە مـێزەر و لـە قـومـەوە وڵات بەڕێوە نابرێت. ئەوانە وڵات وێران دەکەن و دوایی دەڵێن خەتای کوردانە".

قاوەچی لە سەری دەڕوات:

"به قسه وڵات ئاوەدان ناکرێتەوە، بزانە لاوەکانمان چییان لە سەر دیوار نووسیوە".

دیواری شەقامەکەمان نیشان دەدات کە بە خەتێکی خۆش لە سەری نووسرابوو:

"بە یەکێتیی وشە وڵات ئاوەدان ناکرێتەوە، ئێمە پێویستیمان بە یەکێتیی کردەوە هەیە".

قاوەچی هەمدیس دەڵێت:

"ئەوانە تەنانەت خۆیشیان هاوئاواز نین، بڕوانە وشەیەکیان لە زار دەرچووە، چوار - پێنج میلیۆن سوننەیان لە خۆیان زویر کردووە. ئەگەر هێندە شیعە شیعەیان نەکردبا، دۆخێکی ئاوامان بەسەر نەدەهات. ئێستا شیعە و سوننە بە توون، بۆ ئەوان ناڵێن موسڵمانین؟ تۆ سەیری ئەم شەکردانە".

شەکردانێکی نیشان داین.

"شەکری تێ دایە. لە سەرانسەری ئێران وایە".

شەکردانەکە پڕ بوو لە شەکر.

"هەڵسوکەوتی موسڵمانێک دەبێت ڤەدەراتیڤ بێت".

ئێمە پێکەنین گرتبووینی. نەیدەتوانی وشەی ڤیدراتیڤ بێنێتە زمان، بەڵام لە واتاکەی باش تێ دەگەیشت، چونکە شەکرەکانی لە شەکردانەکە دەرهێنا، بە شێوەیەکی یەکسان دابەشی کردن و لە سەر مێزەکە ڕیزی کردن. ئینجا گوتی:

"ئەمە بەشی کورد، ئەمە بەشی فارس، ئەمە بەشی تورک، ئەمە بەشی..."

کوردێکی گەنج کە بەرامبەر بە ئێمە دانیشتبوو، هەڵیدایە:

"کوردەکان بەشی خۆیان دەوێت. ئەوانی تر بەشی کوردیان خواردووە".

قاوەچی درێژەی بە قسەکانی دا:

"ئێمە ئاڕ پی جی-حەوتمان هەیە، دژە تانکمان هەیە، دژە فڕۆکەمان هەیە، شەستیرمان هەیە و عەمبارەکانمان پڕن لە فیشەک".

گەنجە کوردەکە گوتی:

"ئیتر ئەم ڕۆژانە تفەنگ بە کەڵکی هیچ نایە، ئاڕ پی جی 10 نەبێت، ئاڕ پی جی دە تانک بە

حەوا دەخات، ئەگەر لە دوژمنی بگری، وەک قوڕ بە دیوارەیانەوە دەدا".

ئەم گەنجە بە ئاستەم بە فارسی قسەی دەکرد، بەڵام وشەی شیاوی هەڵدەبژارد.

پاش ئەوەی هەواڵەکانی تەلەڤزیۆنەکە تەواو بوون، "بازرگان"ی سەرۆک وەزیر لەسەر شاشە بە دەرکەوت و دەستی بە قسان کرد. سەرەتا هەموویان بە تاسوقەوە گوێیان بۆ ڕاداشت، هۆش و زەینم لە کوردەکان بوو، دەمویست بزانم چۆن لەگەڵ سەرۆک وەزیردا هەڵسوکەوت دەکەن. تێ نەگەیشتم بازرگان چی گوت کە قاوەچی قیژاندی، بەرەو تەلەڤزیۆنەکە ڕای کرد، بە هەموو هێزی خۆی مستێکی لێ دا و کوژاندییەوە:

"فڵتە فڵت، دژەکورد، خوێڕی، دژەکورد".

قاوەچی هەوڵیدا ئەم وشانە بە فارسییەکی پەتی دەرببڕێت بۆ ئەوەی ئێمە باش لە قسەکەی بگەین. ڕق و تووڕەیی لە سەروسەکوتی کوردەکان نیشتبوو. من شەرم دایگرتبووم، سەرم داخست. نەم دەتوانی چاو لە چاوی کوردەکان ببڕم.

ئەو برادەرانەی منیان لە بانەوە هێنابوو بۆ پیرانشار، درێژەیان بە ڕێگەکەیان دا. تا دەمەونیوەڕۆ لە قاوەخانەکە دانیشتم و یادداشتەکانم ڕێکوپێک کرد، ئێستا ئیتر کەم تا کورتێک کوردستانم دەناسی.

لێرە چیتر ناوی موفتیزادە و پیاوەکانی نابیستریێت، لە دەوروبەری بانە ئیدی کەس ناوی ناهێنێت، بەڵام بوونی قیادەی موەقەت و ‌دارودەستەی مەلا حەسەنی لە شار هەست پێ دەکرێت. بنکەی سەربازی جەڵدیان لە نزیک شار، لانەی ئەم بەکرێگیراوانەی کۆمار[ی ئیسلامی]یە. لێرە، ناوی ئایەتوڵڵایەکی ملهوڕ بە ناوی مەلا حەسەنیمان دێتە بەر گوێ. لە هەموو شوێنێک هەست بە بوونی دەکرێت. ئەو لە سۆنگەی خەڵکی ناوچەکەوە هێندەی ژەندەرمەکان پیسە.

دەمەوئێوارە کە هەوا فێنکی کردبوو، بە شەقامی سەرەکیی شاردا پیاسەم کرد. لە شۆستەکانی ئەم شەقامە چەک

وەک نـان دەفرۆشـرێت و دەکـڕدرێت. لە بن سێبەری درەختەکان، لەسەر شۆستە، پیرەمێردی دێهاتی کە بێگومان هەموویان سنوورنشین بوون، لە توورەکەی پلاستیکیدا کـە پێشتر تـایبـەت بـوون بـە شـەکرۆکـە، گوللەی کەلاشینکۆف و تفەنگی ژێ-3 و بڕنەویان دەفرۆشت. ئەگەر لە گەڕەکەکانی باشووری تاران پیاسەت کردبێت و کووتاڵی وردەواڵـەفرۆشـەکـانت بینیبێت کە شانەی گەمار و ددانـی دەستکردی دەستی دو و دەسحێب و کتێبی دڕاو و شـەکردانی شکاو دەفرۆشن، دەبینی لێرەش ڕایەخێکی وەها ڕاخراوە، بەلام کووتاڵی وردەواڵەفرۆشـەکانی ئێرە بریتییە لـە کـەرەستـە و پێداویستی چەکی ڕووسی، ئەمریکی، ژاپۆنی، ئەڵمانی، سووڤنی تفەنگی ژێ - 3، نیشانەی تفەنگی بڕنەو، خەشابی نوێ و کۆنی کەلاشینکۆف، دەمانچەی کۆن (ئەگەر کۆنەفرۆشی ئەجنەبی ڕێگـەیـان بکەوتایە ئێرە، بە هـەر نرخێک بوایـە دەیـانـکـڕی)، ڕۆن، ڕۆنـی تایبەتیی

خاوێنکردنەوەی چەک، ڕۆنی تایبەتیی وەڕێخستنی چەخماغی تفەنگ، سماتەی تایبەت بە خاوێنکردنەوەی لوولەی جوان و بەهێزی بڕنەو، جێ خەشابی پەڕۆ و چەرمی، قایشی تایبەت بە فیشەک، قمقمۆکەی ئاوێ، خەنجەری جۆراوجۆر، چەقۆ، نێزە و تەور و هەر شتێکی بتوانی شەڕی پێ بکەی و ئازادی پێ بە دەست بێنی. زۆربەی کڕیارەکانیش خەڵکی دێ بوون.

هەروا کە بە لای وردەواڵەفرۆشەکاندا هەنگاو دەنێی، دەبینی پیرەمێردەکان دانیشتوون و لە سەر نرخی چەکێک چەنە لێ دەدەن. کابرایەکی خەڵکی دێ کە خەریک بوو بەرامبەر بە بڕنەویەکی کۆن مامەڵەی بە مانگاکەی دەکرد، دواجار بە تووڕەییەوە هاواری کرد:

"بۆچی گرانت کردووە، کاتی شەڕی نەغەدە بوایە، پیاو دەیگوت قەی ناکات، بەڵام خۆ ئێستا شەڕێک لە گۆڕێ نییە، بۆچی وا بە گران دەیفرۆشی؟"

فرۆشیارەکە گوتی:

"هەر بینا شەڕ هەڵگیرسا، هەرزانتری نادەم".

کڕیارەکە گوتی:

"هەتا ئەودەم خوا گەورەیە".

فرۆشیارەکە بێ موبالات وەڵامی دایەوە:

"بۆ دارودەستەی حەسەنی نابینی بەردەرکی شاریان گرتووە".

دێهاتییەکە سووره لەسەر قسەکەی، فرۆشیارەکە پاشەکشە ناکات، کابرایەکی تری خەڵکی دێ ناوبژیوانی دەکات، ئاخرییەکەی برنەوی کۆنی نمره یانزه دەفرۆشرێت و کابراکە، هەوساری مانگا قەڵەوەکەی دەخاتە چنگ چەکفرۆشەکە. پیرەمێردەکە قونداغی تفەنگەکەی لەسەر لاقی دادەنێت، چەخماخەکەی ڕادەکێشێت، بەری دەدا، قامکی بەرەو ماشەکە دەبات، گوللەیەکی خەیاڵی دەتەقێنێت، ئەو فیشەکدانەی پێشتر کڕیبووی، لە نێوقەدی دەئاڵێنێت، گوللە برنەوەکانی لە قایشەکەی دەکات، تفەنگەکەی لە شانی

دەکات، لە کاتێکدا بریسکەیەک لە چاوانیدا دەدرەوشێتەوە، لەوێ دووردەکەوێتەوە.

چەند هەنگاوێک سەرووتر، لاوێکی تازەگەیشتوو، تۆز لە سەروپۆتەلاکی نیشتووە، سێ دەمانچەی ئەڵمانی خستووەتە بەر پشتێندەکەی و کۆڵتێکی سوپای بە دەستەوەیە، بە کوردی هەندێک شت دەڵێت، لادێیەکی تەمەن دەوروبەری چل و پێنج و چل و شەش ساڵی لێی دەچێتە پێشێ، نرخی کۆڵتەکەی لێ دەپرسێت، فرۆشیار داوای نزیکەی پێنج هەزار تمەن دەکات. پیاوە کڕیارەکە چاوێکی پێدا دەخشێنێت و دەڵێت:

"چما شێت بووم کۆڵتێکی وا بە پێنج هەزار تمەن بکڕم؟ هەندێکی دیکەی دەخەمە سەر و دەچم ژێ -3یەکی پێ دەکڕم".

فرۆشیار ڕواڵەتێکی فێڵبازانە بە خۆیەوە دەگرێت، (وەک بڵێی) بڵێت:

"تۆ ژێ-3ت بۆ چییە، دەتەوێت لەنێو شاردا ئێشک بگری؟ تۆ لە مەزرا کار دەکەی، ژێ-٣ی لە کوێ دادەنێیت؟ تۆ دونیایەک

کاروبارت هەیە، دەبێت شتێک بکڕی و لەبەر پشتێندی قایم کەی".

ئینجا ئاماژە بە دەمانچەکانی بەر پشتێندی دەکات، خێرا دەمانچەیەک دەردێنێت، دەیسووڕێنێت، سێرە دەگرێت و قامکی لە سەر پەلاپیتکە دادەنێت و بە خەیاڵ تەقە دەکات. دەڵێت:

"بینیت چەند خێرا بەکارم هێنا. ئایا دەتوانی وا دەستوبرد ژێ-3 بەکاربێنی؟ جا ژێ-3چی پێ دەکرێت؟"

کڕیارەکە پێکەنی و بە گاڵتە شتێکی گوت کە ماناکەی ئاوا بوو:

"پارە کوێری کردووی، دەڵێت بە ژێ-3 هیچ ناکرێت، ئەخە پیاوی چاک ئەو دەمانچەیەی تۆ لەو دەمانچانەیە زیاتر بڕ ناکات کە ئەڵمانییەکان بۆ منداڵەکانیانی دروست دەکەن، لە مریشکی بدەی هەڵینابەزێنێتەوە، ژێ - 3ت بینیوە؟ بینیوتە گوللەکەی تا کوێ دەڕوات؟"

پیاوی فرۆشیار لەو دەلاڵە بە ئەزموونانەیە کە پاشەکشە ناکات، ئەگەر بڕیار بوایە چەکی ژێ - 3 بفرۆشی، وا بە شان و باڵیدا هەڵدەگوتن، نەبێتەوە.

لەو پیاوەم پرسی کە دەیویست چەک بکڕێت:

"ئەم چەکانە لە کوێ دێنن؟"

گوتی:

"دیار نییە. ئەمانە هەر کامە و لەو دیوی سنوور پیاوی خۆیان هەیە. زۆربەی ئەم چەکفرۆشانە دوو لایەنە کار دەکەن. مرۆڤ نازانێت ئێرانین، عێراقین، یان تورکیایی. ئێستا شار هەم عێراقی تێ دایە و هەم تورکیایی. لێرە خزم و کەس و کاریان هەیە. دێن دەکڕن، دەگەڕێن و پاشان دەگەڕێنەوە".

لە کن قاوەخانەکەی تەنیشت وردەواڵەفرۆشەکان، کۆشکێکی ڕۆژنامەفرۆشی هەبوو. گۆڤاری "تهران مصور"، چەند وێنەیەکی کوردە چەکدارەکانی چاپ کردبوو، وتوێژێکیشی لەگەڵ شێخ

عیزەدین حوسێنی کردبوو. ڕۆژنامەفرۆشەکە گۆڤارەکەی لێک کردبووەوە و لاپەڕەی وێنەکانی بە جامخانەکەوە هەڵواسیبوو، خەڵک کۆببوونەوە و لە وێنەکانیان دەڕوانی. پیاوێکی کەڵەگەت چوو گۆڤارێکی کڕی، هات لەسەر کورسی قاوەخانەکە لە تەنیشت من دانیشت، لەوانەیە پێشتر منی دەستنیشان کردبێت. کوردەکانی تریش هاتن، دەوریان دا و داوایان کرد وتویژەکەی شێخیان بۆ بخوێنێتەوە، پیاوە کوردەکە بە ئەنقەست بە فارسی گوتی:

"ڕاوەستن، چاوەڕێ بکەن".

پاشان، بە شێوەیەک کە من ئاگام لە جموجوڵی بێت، بە سەرنجەوە لاپەڕەکانی گۆڤارەکەی هەڵدایەوە. کوردەکان بێ ئۆقرە بوون، دەیانگوت زوو لاپەڕەکان هەڵبدەوە، ئەویش بەرپەرچی دانەوە:

"بێدەنگ، قسە مەکەن".

هەموو چاوەڕێ بوون بزانن چ دەکات، لاپەڕەکانی گۆڤارەکەی هەڵدەدایەوە و لە کوێ وێنەی پیاوێکی ڕیشن (جگە لە وێنەی شێخ

عیزەدین)، وێنەی مەلایەک یاخود مێزەری بینیبا، تفێکی گەورەی ڕۆ دەکرد و دەیگوت:

"ئـەم تفە بـە ڕیشـی تـۆ، ئـەمـەیـان بە مێزەرەکەی تۆ".

کوردەکان بە شانازییەوە لە جموجوڵی ئەو پیاوەیان دەڕوانی و کەیفیان پێی دەهات. لە لاپەڕەیەکدا ناوی مەلا حەسەنی هاتبوو، ئەو لاپەڕەیەی دڕاند، خستییە بن پێیان و گوتی:

"ئەمە بە کەڵکی کوردان نایە".

لە شوێنێک وێنەی کارتەر هەبوو، بە پارێز و بە هەموو هێزەوە سەری وێنەکەی بڕی، بە ددان لەتی کرد و گوتی:

"هەمووی لە بن سەری ئەم خوشک..."

کوردەکان فیکەی سمێڵیان دەهـات، ئێستا چـەنـد پێشمەرگەیەکیش دەوری ئێمەیان گرتبوو، پیاوەکە وەک مریشکێک کە بە دوی دانەوێڵەدا وێڵ بێت، لە ناوەکان دەگەڕا، یەکە یەکە ناوەکانی دەست نیشان دەکرد و بە دەمە چەقۆ لە گۆڤارەکەی دەردێنـان. کوردەکانی دیکەش بۆ دۆزینەوەی ناوەکان یارمەتیان دەدا.

ڕێورەسمی "تف ڕۆکردن"، "لاپەڕە دڕاندن"، "سەربڕین" و "ناوهەڵقەندن" بە خۆشی و سەلامەتی تەواو بوو، گۆڤاری "تهران مصور" کوون کوون و شڕ و دڕ ببوو. لە کۆتاییدا، پیاوەکە گۆڤارەکەی بۆ لای کوردەکان فڕێ دا و گوتی:

"بیگرن، ئێستا ئەمە بووەتە گۆڤارێک کە بە کەڵکی کوردان نایەت".

کوردەکان گۆڤارەکەیان گرت و کردیانە هات و هەرا. پیاوەکە سەیرێکی کردم و بە لە خۆباییەوە چاک و چۆنی لەگەڵ کردم. بە هێمنی وەڵامم دایەوە. چاوێکی بە سەروسیمامدا خشاند، لە ڕواڵەتم ورد بووەوە، ئینجا وەک ئەوەی بەزەیی پێمدا هاتبێتەوە، پرسی:

- ڕێبوارن؟
- بەڵێ، ڕێبوارم.

بە قاوەچی گوت چام بۆ بێنێت. لەو ماوەیەدا هەتا چایەکە هات، زۆر جیاواز لە وەی تا ئێستا خۆی نواندبوو، گوتی:

"کوردەکان زۆریان زوڵم لێ کراوە".

ئەو کاتانەی تفی ڕۆ دەکرد، پێم وابوو دەبێت کرێکاری خانووبەرە بێت، لێ ئێستا کە لە سەرەخۆ دەدوا، وێدەچوو مامۆستای گوندێک بێت.

"فارس و تورک زۆر خراپ دەرچوون. نەدەبوو وایان کردبا. بڕوانن لە نەغەدە چ داغێکیان بە دڵییەوە ناین. کوردەکانیان شاربەدەر کرد. سوپای کۆماری ئیسلامی لەوێ تاوانی ئەنجام داوە. ژنانی دووگیانیان داوەتە بەر دەسرێژ و مەتەرێزیان لێ دروستکردوون. بەم کارەیان سینگی کوردیان شەقار کرد. کاکە، ئەگەر لە بری تورک، بەعسی و ئیسرائیلی و ئەمریکی درااوسێی ئێمە بوایەن، باشتر بوو. ئێمە و تورکەکان برا بووین، حەسەنی و دارودەستەکەی بوونە مایەی نەگبەتی. تورکەکان بۆچی پێش بە حەسەنی ناگرن؟"

ئێستا ئیتر لە سەر ئەو بڕوایەم کە مام سام سەرکەوتووە، ئەو ڕق و قینەی دەیویست لەنێوان گەلاندا بیچێنێت، چاندوویەتی.

کوردەکان، تورکەکان بە تاوانبار لە قەڵەم دەدەن و هاوار دەکەن تورک دەستیان بە خوێنی ژنانی ئێمە سووورە. تورکەکانیش، کوردەکان بە خەتابار دەزانن. مام سام ئاغای سەرجەم زاڵمەکان هەمدیس براوەی مەیدانە.

ئێستا ڕواڵەتی پیاوەکە لە ڕواڵەتی مامۆستایەکی زەجرچێشتوو دەچێت، بە قسەکانی ڕا تێدەگەم مامۆستای گوندەکانی سەردەشتە، ئێستا کە تێگەیشتووە حەزدەکەم زیاتر سەبارەت بە کوردەکان بزانم، حاڵەتە سادە و جەماوەرییەکەی نامێنێت و وەک ناو کتێبان قسەم بۆ دەکات:

"پاسدارەکانی حەسەنی دژە خەڵک و تاڵانچین، ئەوان پارە وەردەگرن بۆ ئەوەی خەڵک بکوژن. سوپا، دژی گەلە. ئێمە بە نرخی خوێنی مرۆڤەکانمان لەمە گەیشتین. ڕادیۆ درۆ دەکات، زمانحاڵی فاشیزمە، کوردەکان ئازار دەدات".

ئەو کاتانەی گۆڤارەکەی هەڵدەدایەوە، جنێوی بە پیاوەکانی قوم دەدا و قسەی بە

ڕێبەرەکان دەگوت، بەڵام ئێستا کە سەبارەت بە قوم و ڕێبەرەکان و دەوڵەت پرسیاری لێ دەکەم، دەڵێت:

"هیچیان لێ نازانم، نایانناسم. ئەوانیش کوردەکان ناناسن. دەوڵەت دەبێت باش تێ بگات، تەنیا بە شێوەیەک دەتوانێت لە چنگ کوردەکان ڕزگاری بێت، ئەویش ئەگەر سەرانسەری کوردستان ئاگر بدات، بۆمبارانی بکات. ئێمە شەڕمان نە گەرەکە، کوردێک نابینێت حەزی لە شەڕ بێت. ئێمە دەمانەوێت ئەم کێشەیە لە دەوری مێز و بە گفتوگۆ چارەسەر بێت. ئێمە دژی شەڕین، بەڵام ئەگەر بەسەرماندا بسەپێنن، ئیتر چارەیەکمان نامێنێت. کوردستان زوڵمی لێ کراوە، کوردەکان هیچ شتێکیان نییە. هەر لەم پیرانشارە لە بری کارگە و پیشەسازی سێ بنکەی سەربازییان دامەزراندوە. ئێمە لێرە دکتۆرێکمان نییە. ئەمن باسی دێهاتەکان ناکەم، باسی ئەم شارانە دەکەم کە دەیانبینی، ئەم پیرانشار و سەردەشت و شنۆیە. ئێمە

ئەگەر منداڵمان نەخۆش بکەوێت، چاو لە ڕێ دەمێنینەوە و بەس. خۆتان بە چاوی خۆتان بینیتان، نە ڕێمان هەیە و نە دەرفەت، دەسەڵاتی هیچیشمان نییە... ئێوە هەق بە کورد نادەن؟"

پاشان ئاماژەی بە بازاڕی وردەواڵەفرۆشەکان کرد و گوتی:

"ئەو پارە کەمەی بە کوێرەوەری بەدەستی دێنین، دەیدەین بە چەکوچۆڵ".

پیاوێکی خەڵکی دێی نیشان دەدا:

"سەیر کە، ڕواڵەت و ژیانی ئەم پیاوە سەد تمەن ناهێنێت، بەڵام ناچارە بە هەر شێوەیەک بووە دەمانچەیەک بکڕێت، چونکە داروودەستەی حەسەنی دێن و گەنمەکەی ئاگر دەدەن".

ئینجا ئاماژە بە چەند پێشمەرگەیەک دەکات:

"سەیر کە، هەموویان هەوڵ دەدەن تفەنگی بڕنوویان هەبێت، چونکە هەموویان دەزانن دواجار دەوڵەت هێرشی هەواییان دەکاتە سەر. بە بڕنە و دەتوانی فڕۆکەیەک بەربدەیتەوە

ئەگەر نزم بفڕێت. وەک دەبینن هەموویان نیگەرانن. بۆچی ئێمە نابێت لە خاکی خۆمان، لە وڵاتی خۆمان، لە ئێران ئاسایشمان هەبێت. تەنیا لە بەر ئەوەی گوتوومانە نانمان دەوێت، نانی خۆمان دەوێت، دەوا و دەرمانمان دەوێت، کارمان دەوێت. ئێمە داوای سینەمامان نەکردووە، ئێمە سەیرانگەمان ناوێت، باغی گشتیمان ناوێت، دەوا و دەرمانمان پێویستە، دەوا و دەرمان. قوتابخانەمان دەوێت، زمانی خۆمانمان دەوێت. داواکردنی ئەم شتانە بۆچی گوناهە؟ گەلی کورد کەی زۆرداری کردووە؟ کێ جیاخوازە؟ تەنانەت ئەگەر بیانەوێت بە تۆبزی لە ئێرانمان دابڕن، نامانەوێت، ئێمە کوردستانمان لە نێو نەخشەی ئێراندا دەوێت، ئێمە پشکێکی گەورەمان لە مێژووی خەباتی ئێران بەردەکەوێت. ئێمە سەلاحەدینی ئەییوبی و کەریم خانی زەندمان هەیە. ئەمانە هەموویان ئێرانین، کورد لە هەموو شوێنێک زوڵمی لێ دەکرێت. بۆ نموونە بڕواننە "سیاهکەل"، ئێستا هەموان سیاهکەل و قارەمانە

شەهیدەکانی ئەو ڕووداوە گەورەیە دەناسن، ئێمەی کوردەکانیش دەیانناسین و شانازیان پێوە دەکەین، بەڵام ئێمە خۆمان کۆمەڵێک سیاهکەلمان لە شاخ و داخەکانی کوردستان بەرپا کردووە و سەدان قارەمانمان شەهید بوون، ئەو قارەمانانەی لەنێو دڵی خەڵک دەرکەوتوون، بەڵام نەیانهێشتووە کەس ئەوان بناسێت. گەلانی تر نازانن کوردەکان چیان کردووە و چ دەکەن".

درێژە بە قسەکانی دەدات، هێدی هێدی تێ دەگەم ئەندامێکی حیزبی دیموکراتە. ئەو پێی وایە ئەگەر حزبێک بتوانێت لە ناوچەکە سەربکەوێت، ئەوا حیزبی دیموکراتە. کاتێک پێی دەڵێم لاوانی ڕۆشنبیری کورد زۆر چارەی ئەم حزبەیان ناوێت و ڕێبەرانی بە هەلپەرەست لە قەڵەم دەدەن و دەڵێن بەس لە فیکری دەسەلات دان، نارەزایی دەردەبڕێت:

"نەخێر، ئێوە هەڵەن، ئەوانیش هەڵەن".

کاتێک دەڵێم لاوەکان حزب تۆمەتبار دەکەن کە لە پرسە چینایەتییەکان ناگات و

پەروەردەی سیاسی نادا بە ئەندامەکانی، دیسان بەرچاوی تاریک دەبێت:

"ئەم قسانە بێ بنەمان، ئێمە ئێستا لە چیاکان ڕاهێنان بە پێشمەرگە دەکەین. سەر و سامان بە ئەندامەکانمان دەدەین و هێزەکانمان پەروەردە دەکەین".

بە دەمارگرژییەوە ئەم قسانە دەکات، بەڵام کاتێک ئەم دێڕانە بۆ لاوێکی خوێندەوار دەردەبڕی، قایلت دەکات کە:

"ئەم حزبە، حزبێکی ڕیفۆرمخوازە. تەنانەت چارەگە سەعاتێک لە ڕووی سیاسییەوە ئەندامانی پەروەردە ناکات. ئەگەر پەروەردەیەک لە گۆڕێ بێت، سنووردارە و تەنیا بواری سەربازی دەگرێتەوە".

شان بە شانی مامۆستا پیرانشارییەکە بە نێو شاردا پیاسەمان کرد. سەرمان لە کۆڵانەکان دا. ڕۆیشتینە دووکانی شووتی فرۆش و شووتییەکمان کڕی. لە دەوری مێزێک دانیشتین و وەک ئەوانی تر لەوێ خواردمان.

**ئەگەر ئاوا بەردەوام بێت کوردەکان بەرگە ناگرن**

دیسـان بـە جـادەی خـاکـی و پڕ پێچدا تێپەڕ دەبین، دیسان ژن و پیاو لەنێو زەوی و کێڵگەکاندا خەریکن ئیش دەکـەن، بـەڵام ئەمجارەیان داربەدەستەکانی حەسەنی، لە بەر چەک کوردەکان دەپشکنن و ناهێڵن چەک لە شارەوە بچێتە دەر. کوردەکانیش هاواری ناڕەزایەتییان بەرز دەبێتەوە:

"باشە ئەم بێگانانە چییان لە ئێمە دەوێت؟"

دەستوور دێت:

"بێدەنگ بن. ئەمانە پشتیوانی قورئان و سەربازی ئیمامی زەمانن. ئێوە بێدەنگ بن. ئێوەی کورد چووزانن ئەم قسانە یانی چی. بهێڵن ئەمانە بواری ژیان لە ئێوە تەنگ بکەن. قسە مەکەن، بێدەنگ بن".

کوردەکان هاواریان لە قوڕگدا دەمێنێتەوە:

"ئەمانە کوا پشتیوانی قورئانن، ئەمانە کوا سەربازی ئیمامی زەمانن؟ ئەمانە گشتیان یان، لۆتی بوون، یان قەرەج. لە دێهاتەکان سواڵیان دەکـرد. بـەس بـۆ پـارە ئـەم کـارانـە دەکـەن،

حەسەنی ئەم هەموو پارەیە لە کوێ دێنێت وا دەیخاتە چنگ ئەمانەوە؟"

دەنگی کوردەکان زێدە بڕ ناکات:

"بۆچی کەس گوێ لە قسەی ئێمە ناگرێت؟ بە خوا، بە محەممەد، بە قورئان، بە عەلی خەریکە قوڕ بە سەر ئەم مەملەکەتەدا دەکەن، بە خوا..."

کاتێک ئەم قسانە دەبیستی، جاڕز دەبیت، ئاگرت تێ بەردەبێت. پیاوانی قوم هیچکامیان کوردستان ناناسن. ئەو بێگانانە چووزانن کوردستان لە کوێیە و کورد بە چ دەردێکەوە دەناڵێنێت. ئێستا ئیتر لە خۆم ڕانابینم هاوار بکەم کە نەک هەر پیاوانی قوم بگرە کەس بە گوێرەی پێویست کوردەکان ناناسێت. بۆ ناسینیان دەبێت بکەویتە ڕێ و لە مەزراکان، لە بەندەن، چیا، ڕێگە، بان و دەشتەکان بیانبینی. ئەوانەی بە ساڵان لە دەرەوەی وڵات بوون و لە هەمووی خراپتر، جگە لە چوارچێوەی وشکی شیعایەتی هیچ شتێک نابینن، ئەوانەی خۆیان بە سەربازی ئیمامی زەمان دەزانن و

ئەگەر کورد نەکوتن، خۆیان بە شەرمەزاری خوا دەزانـن، ئەوانە کوا دەتـوانن تێ بگەن کورد چی دەوێت، ئەگەر ئاوا بەردەوام بێت، کورد بەرگە ناگرێت.

## دەچینە شنۆ

دەشتی دڕکەڵان تێدەپەڕێنین و دەچینە شنۆ. لێرەش، وەک سەردەشت و بانە و پیرانشار، هەمان دەرد هەست پێ دەکرێت، بەڵام ئەندامانی قیادەی موەقەت لێرە ڕاشکاوانە هاتوچۆ دەکەن و بنکەیەکی تایبەتیشیان هەیە. خەسڵەتێکی ئەم شارانە ئەوەیە لاوەکان خێرا بەرەو لات دێن و دەتبەنە نێو کۆڕی خۆیان.

له سەرانسەری کوردستان، بۆ ساتێک هەستم بە تەنیایی نەکرد. لاوەکان لە هەموو شوێنێک لەگەڵم بوون. لە تەک خۆیان منیان دەبردە نێو کۆڕی دۆستان، بنەماڵە و نێو ژیانی خۆیان. مرۆڤی هێندە خوێنگەرمم نەبینیبوو. هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بێگانە زۆر ئاساییە و دوای سەعاتێک، کۆمەڵێک ناسیاوت لەنێو شاردا دەبێت. کە ئێوارە داهات، پێ بە پێی ئەوان بە نێو شاردا پیاسە دەکەی، بە جۆرێک هەڵسوکەوتت لەگەڵ دەکەن، تۆ پێت وایە ئەوان چاوەڕێت بوون و جێگەت خاڵی بووە، پێت وایە تۆ لەوان بووی، چووبوویتە سەفەر و ئێستا گەڕاویتەوە.

له شنۆش زۆر سادە لە تەک لاوەکاندا هەستام و دانیشتم.

- بەخێر بێی، لە کوێوە دێی؟
- نازانم، لە پیرانشار، سەردەشت، بانە، لە...
- لەوێ چ باسە؟
- بە دەردی هاوڕێیەکی بانەیی دەڵێت کوردستان دووگیانە بە دیموکراسی.

- ئەی لای خۆتان چ باسە؟

- لە هەموو شوێنێک بگرە و بەردەیە، مۆتەکە بەربینگی خەڵکی گرتووە. لە شارەکان و لەو شارانەی لە شاری ئێمە دەچن و زۆرن، خەڵک پڕیان داوەتە داردەست و بەربوونەتە گیانی ئەو کەسانەی فام دەکەن، بنەماڵەکان لێکترازاون و گەرموگوڕی جاران نەماوە. باوک دەستیان ناوەتە بینەقاقای کوڕانەوە. برا چاو لە برا سوور دەکاتەوە. ئەمریکییەکان پلانێکی وایان بۆ داڕشتووین کە شوێنەوارەکەی لەنێو ماڵەکانماندا بەدی دەکرێت. ئەمە بووەتە ئافەتێکی گەورە.

لاوەکان لە کارەکانی خۆیان ئاگادارم دەکەنەوە. بۆم دەگێڕنەوە کە چ دەکەن، خەڵکی دێ تا چ ڕادە پێشوازییان لێ دەکەن، جووتیارەکان چ کارگەلێکیان ئەنجام داوە و منداڵانی قوتابخانە لە ڕوانگەی خوێندنەوەی کتێب و ناسینی کتێب چەندە پێشکەوتوون. هەروا کە قسەمان دەکرد بە بەردەم چەند وردەواڵەفرۆشێکدا تێپەڕ بووین، ئێرەش وەک

پیرانشار وایە، پرسیم ئەم هەموو چەکە لە کوێوە دێنن وا لێرە دەیانفرۆشن؟ گوتیان:

"چەکوچۆڵێکی زۆر لە سنوورەوە دێت، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری ژێ-3 کان لە تارانەوە دێن. دەڵاڵەکان ئەم چەکانە بە سێ - چوار هەزار تمەن لە تاران دەکڕن و چەند قات زیاتر دەیفرۆشنەوە. بێجگە لە دەڵاڵەکان، ئێمە پیاوی خۆمان لە شارەکان و بە تایبەتیش تاران هەیە، ئەوان چەکەکان بە نرخێکی هەرزان دەکڕن و بۆمانی دەنێرن. ئەمانە هەر ئەو چەکانەن کە لە کاتی هێرش بۆ سەر بنکە سەربازییەکانی تاران کەوتوونەتە دەست".

شەو، کە لە ماڵی یەکێک لە کوڕەکان مابوومەوە، چەند تەلیسێکی پڕ لە فیشەکی ژێ-3ی نیشان دام و گوتی:

"دۆستانی تارانی ئەمانەیان بۆ ناردووین. هەر ئەو دۆستانەی پێکەوە لە زانکۆ دەمانخوێند، کە دێنە سەردانمان گوللە و تفەنگ و هەرچی بکەوێتە بەر دەستیان، وەک دیاری بۆ ئێمەی دێنن. ئێمە لە شارەکانی

تریش هاوڕێی باشمان هەن. لێرە گوللە زۆر گرانە. تفەنگی باشیش لە کڕین نایەت".

شنۆش وەک شارەکانی دیکە، بچووک، بنبەست و بێ داودەرمان و دکتۆرە. بە بیست دەقە دەتوانی دوو ڕاستەشەقامەکانی بپێوی. لێرەش، وەک زۆربەی شارە کوردنشینەکانی تر، قوتابیان، وەرزی هاوین، پەشمەک و هەڵووژە و شەربەت و خەیاری دەفرۆشن. لە مەودایەکی دە مەتریدا، لانیکەم پێنج کوڕیژگە کەلوپەلی شەربەتیان داناوە و پەرداخی بە پێنج قڕان دەفرۆشن. پاسەکانیش بەردەوام خەڵکی گوند دەهێننە شار و دەیانبەنەوە.

**هەر کەسێک کەڵەگایی لە کوردەکان بکات، کاک محەممەد دەیکوژێت**

هەتا دونیا تاریک بوو، لەگەڵ لاوەکان بە نێو شاردا پیاسەمان کرد. پاشان لە قەراغ شار، لە لێواری چۆمێک دانیشتین و قسەمان بۆ یەکتری گێڕایەوە. پاش تێپەڕبوونی سەعاتێک، سرتە سرتێک کەوتە نێو کوڕەکان و گوتیان "کاک

محەممەد" دێت، لاوەکان تکایان لێ کردبوو چەند خوولەکێکیش لە لای ئێمە دابنیشێت.

کاک محەممەدم نەدەناسی، ئێستا هێدی هێدی لەگەڵی ئاشنا دەبم. کە لە دوورەوە بینیم، بالآیەکی بەرز و پاڵەوان ئاسای هەبوو. جامانەیەکی گەورەی لە سەری پێچابوو، پۆستاڵی تایبەتی لە پێ کردبوو. دەمانچەیەکی لە نێو قەدی هاڵاندبوو فیشەکی لە سەر پشتێن و سەر سینگ و سەر شانی بەستبوو. سمێڵێکی چڕ و گەشی هەبوو. هەموویان بۆ ڕێزگرتن لە بەری هەستان، دیسان سەبارەت بە کاک محەممەد پرسیارم لە کوڕەکان کرد، گوتیان:

"بەس دەتوانین بڵێین کە سەرجەم ژەندەرمەکانی کوردستان دەیناسن و وەک سەگ لێی دەترسن. کاک محەممەد دوژمنی قەستەسەری ژەندەرمەیە، سنوور و منوور ناناسێت".

لاوەکان پێیان گوتبوو میوانێکی فارسمان

هەیە و جەختیان لە سەر ئەوە کردبووەوە کە کوردەکانی خۆش دەوێت. داوایان لێ کردبوو بێت و لەگەڵمان دابنیشێت و بە تایبەت قسە بۆ میوانی فارس بکات.

کاک محەممەد هاتە لام، کاتێک منیان پێ ناساند، لە بەرامبەرم ڕاوەستا و دەستی ڕاداشت، لە حاند وی خۆم وەک جووجەڵەیەک دەهاتە پێش چاو کە هەڵۆیەک لە بان سەری دەفڕێت. تەوقەم لەگەڵ کرد، لە تەنیشتم دانیشت. هەموومان لە سەر عەرزی دانیشتبووین، کاک محەممەد بە ئاستەم بە فارسی دەئاخڤی، گەنجەکان قسەکانی ئەویان وەردەگێڕا، کاک محەممەد ماوەی شانزە ساڵ لە ئێران دوور بووە. کە لەنێو لاوەکاندا دانیشتبوو لە دارێکی پتەو دەچوو و ئێمەش دەتگوت نەمامین. کاک محەممەد دەستی کرد بە ئاخاڤتن. مستی قووچاوی هێنایە پێشێ، نیشانی داین و بە حەسرەتەوە گوتی:

”كە لە ئێوە دوور بووم و لە لاتان نەبووم، دڵم وەک ئەم مشتە گیرابوو“.

فرمێسکێک لە چاوە درشت و ڕەشەکانی کاک محەممەددا قەتیس ما و ئینجا درێژەی بە قسەکانی دا:

”ئێستا کە هاتوومەتە لای ئێوە، دڵم کراوەتەوە. خەم و خەفەتم نەماوە“.

فرمێسک لە چاوی هەمووان زا.

سنوورەکانیان بەستبوو. ژەندەرمەکان لە پشت تێلی دڕکاوی بە ڕیز ڕاوەستابوون و نەیان دەهێشت کاک محەممەد ئاودیوی سنوور بێت و بگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی، شنۆ. شانزە ساڵی ڕەبەق دڵی وەک مشتێک گیرابوو.

کاک محەممەد، سەرەڕای گەورەیی و دەسەڵاتی، هێندەی منداڵێک سادە بوو. هاوکات لەگەڵ شەڕی نەغەدە دەگەڕێتەوە بۆ ئێران و لەوێ بە شێوەیەکی کاریگەر خەبات دەکات و تا دوایین ساتەکان دەجەنگێت. کە سووپا کوردەکان لە شار دەردەپەڕێنێت و کەس

لەنێو شاردا نامێنێت، ئەو هەروا دژ بە سووپا دەجەنگێت، چەند تانکێک دوای دەکەون.

کاک محەممەد بە پێکەنین و خاکەڕایانە بۆمان دەگێڕێتەوە:

"کاتێک پێنج تانکی ئاریامێهر دوام کەوتن (ئەو بە پێداگرییەوە بە سوپا دەڵێت سوپای ئاریا مێهر)، سەیرێکی دەوروبەری خۆمم کرد. بینیم کونە مشکم لێ بووببووە قەیسەری، بە خۆمم گوت محەممەد ئەجەلت هاتووە. کارت تەواوە، تۆ بەم تفەنگەوە، بێ دژەتانک و بازووکا، چلۆن دەرەقەتی ئەم تانکانە دێیت؟"

کاک محەممەد کە ئەمانەی دەگێڕایەوە، هەم خۆشحاڵ بوو و هەم تووڕە. درێژەی پێ دا:

"هەروا کە هەڵدەهاتم، گەیشتمە دارێک، لە نزیک دارەکە چاڵاوێک هەبوو. خۆم تێ هاویشت".

کاک محەممەد گوتی جگە لەو کەس لە ناوچەکە نەمابوو، کوردەکان هەموویان لە شاخیان دابوو. کاک محەممەد خەفەتی

دەخوارد لەو کاتەدا دژەتانک، بازووکا، یاخود شتێکی پێ نەبووە تانکی ئاریامێهری پێ تەفر و توونا بکات. لەسەری ڕۆیشت:

"کاتێک خۆم هاویشتە نێو چاڵەکەوە، تانکەکان نەیانتوانی بمدۆزنەوە، بەڵام من خەمی ئەوەم بوو هیچم پێ نییە بەرەنگاریان ببمەوە. بە چەکێکی ڕووت و قووت شتێکی ئەوتۆ نەدەکرا".

چاوەکانی کاک محەممەد بریسکانەوە و هەستمان کرد دەیەوێت شتێکی سەرنجڕاکێش و گرنگمان بۆ بگێڕێتەوە. ئیستێکی گرت و بەردەوام بوو:

"تانکەکان کە ئیتر کەسیان لە دەوروبەر بەدی نەکرد، ڕاوەستان. لەو کاتەدا، دەرگەکەی بان تانکەکە کرایەوە، پلەدارێک سەری هێنایە دەرەوە و هاواری کرد:

"ئەم کوردە خوشک ... بۆ کوێ هەڵاتن..."

کاک محەممەد لەبەر خۆیەوە دەگوڕێنێت:

"کورد لێرەن".

وەک ئەوە وایە ئێستا لەنێو چاڵەکە دابێت و ئەفسەرەکە تازە جنێوی دابێت. چەکێکی لە لاوێک وەرگرت، جووڵایەوە، چۆکی دادا، نووکی جاسووسەی چەکەکەی میزان کرد، پەلەپیتکەی ڕاکێشا و گوڕاندی. ئەفسەرەکە مێشکی پژا.

لاوەکان لە خۆشیان هاواریان کرد، کاک محەممەد چەکەکەی دایەوە بە خاوەنەکەی و لە جێگەی خۆی دانیشتەوە. نێوچەوانی ئارەقی کردبوو. بە ئەسپایی، بەڵام بە توڕەیی و لە بەر خۆیەوە گوتی:

"مێشکیم پژاند. کورد لێرەن، لێرە".

کاک محەممەد هەموو تەمەنی لە چیاکان تێپەڕاندبوو. شەڕی دژ بە بەکرێگیراوەکان نەبێت، هیچی تری نەدەزانی.

- کاک محەممەد خوێندەواریت هەیە؟

- خوێندەواریی نووسین و خوێندنەوە نا، خوێندەواریی چەکم هەیە. چیاکان دەناسم، ژەندەرمە دەناسم.

- کاک محەممەد ئیشت چییە؟ بۆ خورد و خۆراک چ دەکەی، بژیوی ژیانت چۆن دابین دەکەی؟

- ئیشم ئەوەیە کێ کەڵەگایی لە کوردەکان بکات، بیکوژم. خورد و خۆراکیش هەرچی بێت، بە یەکەوە دەیخۆین، ئێمە قەت هیچمان نییە، لە چیاکان نێچیر چنگ دەکەوێت، نان دەگات، هەموومان پێکەوە لە سەر سفرەیەک نان دەخۆین. پاشان دیسان نان دەست دەکەوێتەوە، نێچیرەکان لە چیا هی پیاوانی چیان.

- کاک محەممەد چیت هەیە؟

به پێکەنینەوە گوتی:

"کورد لە ماڵی دونیایە، ئەوەندەی هەیە بیخاتە نێو پرێسکەیەکەوە و بە کۆڵی دابدات. کە پرێسکەکەی هەڵگرت دەبێت، یان بجەنگێت، یان ئاوارە و دەربەدەر بێت، یان سەد ژەندەرمە بە دووی تفەنگەکەی خۆیدا ڕاکێشی چیا بکات و لە ژێر ئاگری گوللەکانیان سنوور ببەزێنێت".

ئاماژەی بە دەستی کرد و گوتی:

"هەر ئەوەندە".

شەوی دواتر، بیستم لە هەموو شوێنێک دەڵێن:

"کوردەکانی مەریوان شاریان چۆڵکردووە".

بە سەرسووڕمانەوە دەپرسم:

"بۆ، چۆن؟"

زۆر ئاسایی وەڵامیان دایەوە:

"دەوڵــەت گـوشـاری هـێـناوە بـۆ ئـەوەی لە وێ بنکەی سـەربـازی دروسـت بکات و ژەندەرمە بێنێت، ئەوانیش چونکە نایانەوێت دەسـتـەویـەخـەی دەوڵــەت ببـنـەوە، بـە شەو دەسـتـی منداڵەکانیان گـرتـووە، شـاریـان بۆ دەوڵەت بەجێهێشتووە و ڕوویان کردووەتە دەشت و کەژەکان".

ئێستا لە واتای قسەکەی کاک محەممەد تێ دەگەم.

کاک محەممەد دیسان قسەمان بۆ دەکات. کوڕەکان زۆری پرسیار لێ دەکەن، سەبارەت بە چۆنییەتی شەڕکردن، خۆڕاگری و هەڵاتن لە کاتی خۆیدا.

کاک محەممەد کە سەبارەت بە شەڕکردن قسە دەکات، ڕواڵەتێکی تر بە خۆوە دەگرێت، بەڵام دەزانێ ئێرە چیا نییە و ئەم لاوانە لە بری ئەوەی تەمەنێکیان لە شاخ و داخەکان بەسەر بردبێت، لە پشت مێزەکانی قوتابخانە دانیشتوون. چەکەکەی بە دەستەوە دەگرێت و هێدی هێدی، بەڵام قورس و قایم، ڕێ نیشانی لاوەکان دەدات. تفەنگەکەی بەرزدەکاتەوە، دەنگی تێکەڵ بە خوڕەی چۆمەکە دەبێت:

"چەک ناموسە..."

لاوەکان چاوی تێ دەبڕن.

"... کورد مافی خۆی دەوێت".

"بە چەک ئەو مافە بە دەست دێنێت".

ئاماژە بە لاوانی دەوروبەری دەکات.

"بەم لاوانە بە دەستی دێنێت".

لاوەکان گوڕ و تینیان دێتە بەر.

"کەس مافی کورد نادات. ئێمە دەبێت خۆمان مافی خۆمان بەدەست بێنین".

کاک محەممەد درێژە بە قسەکانی دەدات:

من بیر لەوە دەکەمەوە ئەم کاک محەممەدەم لە شوێنێک بینیوە، کەچی ئەخت و چار دەکەم نایەتەوە یادم. شەوێک کە لە ماڵی یەکێک لە گەنجەکان بووم، هەروا بیرم لەوە دەکردەوە داخوا لە کوێ چاوم پێی کەوتووە. بۆ ساتێک شتێک بە مێشکم دەگات و دێتەوە یادم لە کوێ بینیومە. لە ترۆپکی چیاکان، لەو ئەفسانانەی بە منداڵی بیستوومانە و لە کتێبەکاندا خوێندومانەتەوە. ئەودەم کارەبامان نەبوو، دایک ماندو و مردو لە کار دەگەڕایەوە، چراکەی لە سەر کورسی دادەنا و مێشوولە دەوریان دەدا. شێومان دەخوارد، دایکە بەڵێنی دابوو چیرۆکمان بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام هێند هیلاک بوو، هەر بە لادا دەهات. ئێمە تکامان لێ دەکرد، دەپاڕاینەوە چیرۆکمان بۆ بگێڕێتەوە و دواجار، لە ناچارییان، بە خەواڵوویی بۆی دەگێڕاینەوە:

"ساڵانێکی زۆر لە مەوپێش، لە چیا دووردەستەکان، ڕۆژێک لە ڕۆژان، پیاوێک..."

## بەشداری ڕێورەسمی بە خاکسپاردنی پێشمەرگەیەک دەبین

دووەم ڕۆژی مانەوەم لە شنۆ، بابەتی شەڕی "سێروێ" (گوندێکی نزیک سنووری تورکیا)، کە لە شارەکانی دیکە وەک دەنگۆیەک بڵاوببووەوە، تا دەهات گەرموگوڕتر دەبوو، سات بە سات هەواڵی نوێ دەگەیشت، دەڵێن خەڵکی دێ دژ بە دارودەستەی حەسەنی و ژەندەرمەکانی ناوچەکە کە ویستوویانە لە بنکەی سەربازیی سێروێ جێگیر بن، بە شەڕ هاتوون. هەواڵی دیکەش دەگەن، دەڵێن شەڕ لەنێوان ئاغاکان و حەسەنی ڕووی داوە. هەرچی بێت هەموو ڕۆژێک، جەنازەی شەهیدێک دەگاتەوە شارێک، ئەمڕۆش نۆرەی شنۆیە. پێشمەرگەیەکی شنۆیی لە سێروێ کوژراوە، تەرمەکەی دەهێنرێتەوە بۆ شار، شار هێمنە. خەڵک متەقی لێوە نایە. هەموویان بێدەنگ و بە ڕێزەوە شەهیدەکە دەبەنە سەر گردێک کە گۆڕستانی شارە. ئەو کەسانەی لە شەڕی نەغەدەش شەهید بوون، هەر لە وێ بە خاک سپێردراون.

هـەر شـار و گوندێکیان بە جەنگێکەوە خەفەتبار کـردووە؛ شـەڕی نـەغـەدە، سنە، مەریوان، سێروێ و ئەو شەڕانەی لە داهاتوودا دەیانسەپێنن. ئێستا ئـەوە ئـەم شـەهیدەش بەخاک دەسپێرن. کوردەکان تەپۆڵکەکەیان داگیر کردووە. ڕق و تووڕەییان سەبارەت بە دەوڵەت و بەکرێگیراوەکانی لێی دەڕژێتەوە. لە بان گـۆڕی شەهیدەکان کێلێکی ستوون ئاسا دانـدراوە کە نەخشی کەلاشینکۆفێکی ڕووسـی لـەسـەر هـەڵقـەنراوە. لـەم لاو لەو لایشی سروودێکی کوردی نووسراوە.

شەهیدەکە بە خاک سپێردرا، خەڵکەکە لە گردەکە هاتنە خوارێ.

دەوڵـەت ناهەقی نییە لەم کەلاشینکۆفانە بسڵەمێتەوە، کە ئەم چەکانە دەکەونە دەست کوردەکانەوە، ئیمپریالیزم چۆکی وە لەرزین دەکەوێت. کەواتە تا درەنگ نەبووە، وە خۆ بکەون. کوردەکان بخنکێنن. کلاشینکۆفەکان لە دەستیان دەربێنن.

داورودەستـەی حـەسـەنی کـە خـۆیـان بە سەربازەکانی کۆماری ئیسلامی دەزانن، ئەو چەقۆکێشانەی بە بەکرێگیراوی بوونەتە لە بەرکەری قورئان، بە درێژایی ڕێگەکان، بە تانک و چەک و چۆڵەوە دەبینرێن. کە دەچیتە شـاری نـەغـەدەوە، لە دەروازەی شـارەکەوە (بە ئاراستەی شاری شنۆ) ئیدی جلوبەرگی کـوردی نابینی. بـە دەردی ئـەو کوڕێژگە بانەییە، هەموویان پانتۆڵی قایشداریان لە پێیە، وێنەی خومەینی و شـەریعەتمەداری بـە جامی دووکـانـەکـانـەوە هـەڵـواسـراوە. لە کن هـەر وێنەیەکی خومەینی لانیکەم دوو وێنەی شەریعەتمەداری دەبینرێن. دیاردەیەک کە لە هیچ کوێی کوردستان نموونەی نییە. پیاوەکانی حەسەنی، پاسەوان و ژەندەرمە بە چەکەوە بە نێو شاردا بڵاوبوونەتەوە، کە بە شەقامەکانی شاردا پیاسە دەکەم و پیاوە قایشدار و چەک بەدەستەکان تێدەپەڕێنم، دەگەمە بەشێکی شار کە ئارام و بێدەنگە.

دووکانەکان داخراون و پەپوو لێی ناخوێنێت. کە زیاتر هەنگاو دەنێم، دەبینم لەم بەشەی شـار، ماڵەکان و دووکـانـەکـان ئـاگـردراون، ڕووخێنراون، چرا، بەڕە، بەرمیل، سەماوەر و نەعلەی سووتاو بە کۆڵانەکاندا پەرش و بڵاوبوونەتەوە. بە بیرم دێتەوە ئێرە نەغەدەی وێرانە و کۆماری ئیسلامی ماڵەکانی بەسـەر کـوردەکـانـدا خـاپـوور کـردووە. لە کۆڵانێک، کوڕێک، سندوقێکی لە پێش خۆی دانـاوە و دۆ دەفرۆشێت. لە کنی دادەنیشم و دەیدوێنم. سەرەتا متمانەم پێ ناکات، پاشان چاوێک بە جانتاکەمدا دەخشێنێت و دەڵێت:

- هەواڵنێری؟
- نا، ڕێبوارم.
- تورکی؟
- نا، تورک نیم.

هێدی هێدی متمانەم پێ دەکات و دێتە گۆ.

- لێرە، لەم گەڕەکە، کورد دەژین. سوپا، هەموویانی شاربەدەر کردووە.
- ئەتۆش کوردی؟

- بەڵێ.

- ئەی لێرە چ دەکەی؟ ئێوە لەگەڵ ئەوانی تر نەڕۆیشتوون؟

پەرداخێک دۆم بۆ دادەگرێت.

- ئێمە هەموومان هەڵاتبووین. لە چیاکان دەژیاین. لە دێیەک نانیان بۆ دەهێناین، بەڵام ئێمە پارەمان نەبوو، دەبوایە بگەڕێینەوە و کار بکەین.

- کاری چی؟

ئاماژە بە کەلوپەلەکانی دەکات و دەڵێت:

- دۆی دەفرۆشم.

- کێ لێت دەکڕێت؟

- خەڵک دێنەوە، ناچارن، ناتوانی لەو شاخ و داخانە بمێنیتەوە.

دەڵێم:

"ماڵەکەی ئێوەیان نەڕووخاندووە؟"

وەک ئەوەی ڕەوا بێت ماڵەکەیان بەسەردا بڕووخێنن، دەڵێت:

"ئاگریان تێ بەردا. دوو ژووریان سووتاند، کەلوپەلەکانی ماڵەوەیان لێ دزین، هەرچی هەبوو تاڵانیان کرد".

لێی دەپرسم:

"کەستان لێ کوژرا؟"

وەک ئەوەی کوژران بۆ کوردێک ئاسایی بێت، وەڵام دەداتەوە:

"باوەگەورەم پیر بوو، نەیتوانی ڕابکات، لە ماڵێ مایەوە. داروودەستەی حەسەنی هاتن و بە چەقۆ ورگیان هەڵدڕی".

بڕوام بەم قسانە نەدەکرد، پێم وابوو ڕەنگە درۆ بن، نۆرپیمە ڕووخساری، بۆ دەبوایە درۆ بکات؟

لێم پرسی:

"درۆ ناکەی؟!"

دیسانیش وەک ئەوەی ئەم پرسیارە ئاسایی بێت و مافی کوردێک بێت لێی بپرسین درۆ ناکات، گوتی:

"نا، دوای چل ڕۆژ لە چیاکان هاتینە خوار و چووینەوە ماڵێ. ماڵەکە بۆنی گرتبوو. کەس نەبوو باوەگەورە بنێژێت. بۆگەن ببوو. خوێن لە دەوروبەری وشک هەڵگەڕابوو. مێش و مەگەز..."

لە قسەکەم پەژیوان ببوومەوە.

## سوپا لە نەغەدە تاوانی کردووە

لەو ماوەیەدا کە کوڕە دۆ فرۆشەکەم دەدواند، چەند لاوێکی کورد دەوریان دام. دیسان، وەکوو سەرجەم شارەکانی تر، باس و خواسم لەگەڵ دامەزراندن. پێکهاتین وێرانەکانی شارم نیشان بدەن و قسەم بۆ بکەن. پارەی دۆم دا بە کوڕەکە، بەڵام ئەو وەری نەگرت و گوتی:

"نا کاکە، پارەتان لێ وەرناگرم".

تەوقەم لەگەڵ کرد و شان بە شانی لاوەکان وە ڕێ کەوتم بۆ ئەوەی گەڕەکی کوردەکان ببینم. ئەوان دەیانگوت:

"نەگبەتییەکی گەورەیە. ئێمە و تورک دۆست بووین. هەموو هاوڕێیانی ئێمە تورک بوون، بەڵام ئەو شەوە نەمانزانی چ ڕوویدا، چ هاتە پێش کە هەمووومان لە بیرمان چووەوە هاورێی یەکترین. دەستەویەخەی یەکتری بووین. ئێمە لانیکەم بیست، بیستوپێنج ساڵ پێکەوە یاریمان کردبوو. لێ لەو کاتەدا، چەکمان هەڵگرتبوو سێرەمان لە یەکتری گرتبوو. ئێمە نازانین خەتای کێ بوو، بەڵام قەت لەگەڵ تورکەکان کێشەمان نەبووە. ئەم ڕووداوە هەندێک دەستێکی لە پشتە".

لاوەکان پێداگربوون لە سەر ئەوەی کە هەندێک دەست لە پشتەوە هەن، بەڵێ ڕاستە، چەند دەستێک لە پشتەوە هەن، دەستی چەند پیاوێکی دەوڵەت، چەند کەس لەوانەی لە دەوری ناوەندیی دەسەڵاتی قوم کۆبوونەتەوە،

ئەوانەی بوونەتە دەسکەلای ئیمپریالیزم و بە زورنـای ئەو هەڵدەپەڕن. ناتوانی پەنجە لە سەر ئەو کەسانە دابنێیت و بڵێیت "ئەمەیە، بەڵێ ئەمە کاسە لێسی ئەمریکایە". کەس لە خۆی ڕانابینێت. وە نەبێت لە ژەندەرمە یـاخـود لـە مـەلایـان بتـرسـن، نـا. لـە خەڵک دەترسن، لەو خەڵکەی خەریکە بە مست دەم کوت دەکرێن. دەبێت چەندە هاوار بکەی کە ئیمپریالیزم کوردستانی (کوردستانی ئێران، عێراق، تورکیا، سووریا) دەوێت، تاوەکو بەو پاشڤەڕۆییەی لەگەڵ خۆی دەیهێنێت، بەگژ گەلانی خەباتگێڕی ئێرانی، عێراقی، سووری و فەلەستینی و ...دا بکات. دەبێت چەندە هاوار بکەی کە یەکەمین و سەرەتایی ترین تاوانی ئیمپریالیزم ئەوەیە ئەو گەلانە بکاتە دوژمنی قەستەسەر کە چەند سەدەیە بە خۆشی پێکەوە ژیاون، ئەو مرۆڤانە بە گژ یەکتر دابکات کە بیست، بیست و پێنج ساڵ هاوڕێی یەکترین، بـەڵام بە جارێک و لە کاتی خۆیدا، ئەمریکا پیاوەکانی دەنێرێت، مرۆڤی هەرە ڕووڕاست

بە شەوێک گەندەڵ دەبن و ڕۆژی دواتر، سوپا دەبێتە سوپای خۆشەویستی کۆماری ئیسلامی و کوردەکان دەبنە خاین بە دین و کۆمار و ئاکامەکەیشی دیارە.

گەنجەکان، کۆڵانە خامۆش و ماڵە چۆڵکراوەکانیان نیشان دام. لەبارەی شارەکەوە پێیان گوتم:

"نزیکەی دو لە سێی دانیشتووانی ئەم شارە تورکن. ئەوان سەرەتا لێرە نەبوون، بەڵام تورکەکان مێشکێکی ئابووری باشیان هەیە، زۆر بە ئاسانی توانیان ڕێگەی نیشتەجێ بوون لە ناوچەکە بدۆزنەوە و ئابووری ئێرە بگرنە دەست خۆیان. کەچی کوردەکان بیر لەم شتانە ناکەنەوە، سەرباری ئەو هەمووە زوڵم و ستەمەی لێیان کراوە، کوردەکان نەتەوەیەکن متمانە بەوانی تر دەکەن و لێ دەگەڕێن ئەوانی تر کەڵکی ئاوەژوو لەم سادەبوونەی ئەوان وەربگرن و سواری کۆڵیان بن".

دەیانگوت:

"بـــــازاڕی شـــار لـێـرەکـانـە بـەدەسـت تـورکـەکـانـەوەیـە، نـانـەواخـانـە، قەسابخانە، نەوتخانە هەر هەمووی هی ئەوانە. کوردەکان خەریکی کرێکارین. لە کوورەخانەکان مل وەبـەر ئیش دەنێن و پـارەکـەی لـە بـازاڕی تـورکـەکـان خـەرج دەکـەن. ئـەمـانـە بـە هیچ شێوەیەک کێشە نـەبـوون، کـەس بیری لەو شتانە نـەدەکـردەوە. ئەگەرچی لە ڕوانگەی خۆشـگـوزەرانـی، تـەنـدروسـتـی، دۆخـی ئـاو، کارەبا و پاک و خاوێنی گەڕەکەکان، ڕەوشی کـوردەکـان لـە هـی تـورکـەکـان خراپتر بـوو، دیسانیش کـەس نـاڕەزایـی دەرنـەدەبـڕی، ئەگەرچی تورکەکان بە پـارەی کـوردەکـان بوونە میلیۆنێر، لەگەڵ ئەوەشدا کەس متەقی لێوە نـەهـات، هەموویان بە تەناهی پێکەوە دەژیان. لێ کتوپڕ، دوای شۆڕش، مەسەلەی شیعە و سوننە هـاتـە گـۆڕێ و بەهەموو هێزی خۆیان پەلاماریان داین. بڕۆن بزانن جامێکی پەنجەرەی تورکەکان شکاوە، ژیانیان بچووکترین درزی تێ نـەکـەوتـووە. کەچی

کوردەکان ماڵ و حاڵیان نەماوە، ئاخۆ ئەمە خۆی لە خۆیدا دەربڕی هیچ شتێک نییە؟"

گەنجێک بە قسەکانی منی خستەوە بیر مامۆستا پیرانشارییەکە. دەیگوت:

"نەغەدە وەک فەلەستین وایە. ئێرە داگیر کراوە، ڕێک چەشنی فەلەستین کە زایۆنیستەکان هاتن لە ماوەی چەند ساڵێکدا، ماڵەکانیان یەکە یەکە لە فەلەستینییەکان کڕی، ئابووری فەلەستینیان گرتە دەست و لە دەرفەتێکی گونجاودا، بە پشتیوانی ئینگلیز، بە تانک ماڵەکانیان بە سەردا ڕووخاندن، دەستەیەکیان شاربەدەر کرد، دەستەیەکیان کوشت و شاریان خستە ژێر ڕکێفی خۆیان. لێرەش، دۆخەکە بە هەمان شێوەیە. تورکەکان چەندان ساڵە زەوی و زاری کوردەکان دەکڕن، ماڵ ساز دەکەن و ئابووری شاریان بە دەستەوە گرتووە".

چەند ماڵێکی گەڕەکە کوردنشینەکانی نیشان دام و گوتی:

"هەرچەند لە نێوان بەشی کوردنشین و بەشی تورک نشیندا شەقامێک هەیە و ئەمەش سنوورێکە کە ئەو دو بەشە لێکجیادەکاتەوە، سەربارى ئەوەش تورکەکان هاتن و لەم گەڕەکە خانوویان دروستکرد. هەر ئەوانەش دەستەویەخەی کوردەکان ببوون. ئەمە پێی دەگوترێت داگیر کردن و ئێرە پێی دەگوترێت فەلەستین. ئێمەش ئاوارەی فەلەستینین و لە پێناو ژیاندا دەبێت بجەنگین".

پێی بە پێی لاوان، بە کۆڵان و ماڵە وێرانبووەکانی کوردەکاندا گەڕاین. شەو لە ماڵی یەکێک لە لاوەکان کۆ بووینەوە، کاتێ شێو کە سفرەیان ڕاخست، تەنیا نان و پەنیر لە سەر سفرەکە بوو. لاوەکان، شەرمێون، بەڵام هاوکات بەوپەڕی لە خۆباییەوە گوتیان:

"ببوورن، هیچ بۆ خواردن شک نابەین، ماوەیەکی زۆر ئاوارە بووین، ئەوە یەک دوو شەوە گەڕاوینەتەوە ماڵێ. پارەمان نییە، چرامان نییە، نەوتمان نییە - هیچمان نییە، لەگەڵ ئەوەشدا بڕیارمان داوە ئیتر هیچ لە تورکەکان نەکڕین. بڕیارمان داوە ئابووری تورکەکان لە

نەغەدە ئیفلیج بکەین. بۆیە ئێوەش دەبێت ئەم شەو نان و پەنیری بخۆن".

نانێکم لەت کرد، لەتە پەنیرێکم تێ هاویشت و کردمە پاروو، وەک کوردێک کە خەیاڵی ئیفلیج کردنی ئابووریی تورکەکانی لەسەر دایە، پارووەکەم بەرەو زارم برد.

**دەبێت ئاگادار بم، خەریکە بە هەڵەدا دەچم**

خەریکم بە هەڵەدا دەچم، گومان لە وەدا نییە زۆر جار لە هەڵسەنگاندنەکانم، لە لێکدانەوە و یادداشتەکانمدا لارێ بووم. وەک ئێستا، سامناکە من هەستێکی دژەتورک بە سەرمدا زاڵ بێت. لە سەر سفرەی ئەو هاورێ نەغەدەییانە بە ڕاستی خۆم وەک کوردێک دەهاتە بەر چاو و بە ڕقەوە خۆم لە گەلانی تر جیادەکردەوە. دەبێت زۆر ئاگادار بین بۆ ئەوەی تووشی هەڵە نەبین. ئیشی ئێمە ئەوەیە گەلە زوڵملێکراوەکان یەک بخەین، لاوانی ستەم چێشتووی کورد و تورکی نەغدەیی دەبێت دەستی یەکتر بگرن، دەبێت پەرە بەم هاورێیەتیە بدەین، ئەوان

دوژمنێکی هاوبەشیان هەیە و ئەو دوژمنەش سەرمایەدارییە. سەرمایەداری گەورە، خاوەندارییەتی تایبەتە، ئیمپریالیزمە، لێرە و لە هەموو شوێنێکیش نوێنەرەکەی ئەمریکایە. سەرمایەدارێکی تورک بە قەد سەرمایەدارێکی کورد، تورک و کورد و بە لووچی زوڵملێکراو دەچەوسێنێتەوە. لاوانی نەغەدەیی ئێژن کوردەکان نەتەوەیەکی زوڵملێکراون، دەڵێن کوردەکان بەردەوام کرێکارییان کردووە، لە کوورەخانەی تورک و فارسەکان کاریان کردووە، دەڵێن کوردەکان فێڵیان لێ کراوە و سواری کۆڵیان بوون.

باشە، ئەمانە هەموویان ڕاستن، بەڵام دەبێت بزانین بۆچی کوردەکان بەردەوام کرێکارییان کردووە و سواری کۆڵیان بوون؟

**لاوەکان هەتوانی دەردەکە نیشانی بێگانە دەدەن**

لاوەکان، لاوە ئەمەگناسەکان، ئەو لاوانەی دەدرەکە دەناسن، لە هەموو شوێنێک، تۆی بێگانە کە بە هی خۆیانی دەزانن، دەبەنە سووچێک و ڕیشەکانی دەردەکەت نیشان

دەدەن. بێگانە کە ماوەیەک لە ناوچەکە دەمێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێت ئەم لاوانە بوونەتە خاوەنی چەکێکی زۆر کاریگەر، تاوەکو بەم چەکەوە بچنە شەڕی هۆکارەکان و نایەکسانییەکان. ئەو چەکە کاریگەرەی ئێستا خەریکە چۆنیەتی بە دەستەوە گرتن، کردنەوە، نیشانەگرتن و تەقاندن و هاوکات لەگەڵیشیدا چۆنییەتی ڕیزبوون، پەیڕەوی لە فەرمان، دەستووردان و وە ڕێ کەوتن فێردەبن، چەکی "بەیداخی ڕزگاریی زەحمەتکێشان"ە.

گەلانی تریش، کە وادەی خۆی هات، بۆ پیادەکردنی سۆسیالیزم دێنە کوردستان، پەروەردە دەبینن و ڕاهێنانیان پێ دەکرێت.

**پیاوەکانی حەسەنی لەبەر چەک ڕێبوارەکان دەپشکنن**

کە بەرەو مەهاباد دەچووین، لە سێڕایەک کە ڕێگەیەکی بەرەو ورمێ، یەک بەرەو نەغەدە و ئەویتری بەرەو مەهاباد دەچوو، پیاوەکانی حەسەنی ڕێبوارە کوردەکان و بێگانەکان دەپشکنن بۆ ئەوەی بزانن چەکیان پێیە یان

نـا. کاتێک دێنە نێو پاسـەکەوە بۆ ئـەوەی ڕێبوارەکان بپشکنن، کوردەکان بە ڕادەیەک دەڕەنـجـێـن کـە زۆری نامێنێت لـە داخـان هـاوار بکەم، بـەڵام وەک کـوردەکـان سـەرم بـەردەدەمـەوە و بە سـەری لارەوە ئیزنمدا چەقۆکێشەکانی حەسەنی، پارێزەرانی قورئان جانتاکەم بگەڕێن. لە سەرانسەری کوردستان کەس تەنانەت بیری لە وە نەدەکردەوە یەکێک لێت بێتە پێشێ و بڵێت نـاوت چییە، چ بگا بـەوەی بتپشکنن، تەویڵم ئـارەقـی کردبوو، وەک سـەرجـەم کـوردەکـان. پاسەکە کەوتە ڕێ، ڕق لە سیمای هەموویاندا بەدی دەکرا. بەرەو مەهاباد درێژەمان بە ڕێگەکەمان دا. لە شوێنێکی نزیک دەروازەی شـار، پێشمەرگەی کورد پاسەوانیان دەدا. کـوردە ڕێبوارەکان هەر چاویان بەوان کەوت شـاگەشکە بوون. سیمایان کرایەوە و بزە لە سـەر لێوەکانیان نیشت. چـاویـان بریسکەی دا. دەستیان بۆ ڕاوەشـانـدن و دوعـایـان بۆ کـردن. سـەریان بەرزکردبووەوە، کەس خەفەتبار نەبوو. کەس

بە خۆیدا نەدەشکایەوە. ئارەق لە نێوچەوانی کەس نەدەتکا. کەس مشتی نەقووچاندبوو. ئـەوان متمانەیان بە پێشمەرگەکان هەبوو. ڕۆڵەی خۆیان بوون. دەردی کوردیان دەناسی، کـورد بـوون. بەکرێ گیراو نـەبوون. لەنێو زەوی و زارەکان کاریان کردبوو، زەجریان چێشتبوو. کە نەخۆش کەوتبوون، ددانیان بە جەرگ داگرتبوو. ئەوەی مایەی گاڵتەجاڕییە ئەوەیە کە دەوڵەتییەکان ناتوانن بە ئاسانی لەمە بگەن، لە تارانەوە پاستاریان بۆ دەنێرن. حەسەنی قووت دەکەنەوە، لە ڕادیۆوە هاوار دەکەن. چ بێ بەختە ئەو نەتەوەی تووشی بە تووشی کەسانێک بێ کە ئاشنای دەرد نین.

**هەموو کەسێ دەڵێت بڕۆ و مەهاباد ببینە**

کە بە کوردستاندا دەگەڕێی، ڕووبەڕووی کەسانی جۆراوجۆر دەبیتەوە. هەموویان باسی مەهاباد دەکـەن، دەڵێن دیموکراسی لەوێ جێگیر بووە. ئازادی ڕەها لەوێیە. بێ سەبرانە چاوەڕێم مەهاباد ببینم.

بە ڕێکەوت، لە شوێنێک، کە لە پاسەکە هاتینە خوارێ، ڕێک لە بەرامبەرم، لە سەر بانی ماڵێکی گڵینی دوو نهۆم، لە قەراغ شەقام، چەند حاجی لەق لەقێک هێلانەیان چێ کردبوو، دوو حاجی لەق لەق لە سەر گوێسوانەی ماڵەکە لە سەر لاقێک ڕاوەستابوون. بە بینینیان بیرم کەوتەوە کە هەموو دەیانگوت مەهاباد شارێکە دەتوانی لێی بژی.

دەر و دیواری شار بە بەیاننامە داپۆشراوە، زۆربەی بەیاننامەکان هی ڕێکخراوی پارتیزانە فیداییەکانی گەلی ئێران - لقی کوردستانن. ئەم ڕێکخراوە بە شێوەیەکی سەیر توانیویەتی لە کوردستان پێگەیەک بۆ خۆی دروست بکات و لایەنگرێکی زۆر کۆ بکاتەوە. لە هەموو شوێنێک بە چاوی ڕێزەوە لە فیداییەک دەڕوانن.

ئەم ڕێکخراوە ئەگەر بە هەمان شێوە بەردەوام بێ، دەتوانێ زۆر خێرا لە نێو گەلانی تردا ببێتە خاوەن پێگە و ڕێکخراوی بەهێز و یەکەم لە ئاستی وڵاتدا. بە هۆی ئەوەی لایەنگرەکانی ڕووڕاست و لە دڵەوە

کـار دەکـەن، دەتـوانـن لاوازی، کەمایەسی و بێ ئەزموونیی سیاسی ئـەم ڕێکخراوە چارەسەر بکەن و خێراتر بیکەنە ڕێکخراوێکی جەماوەری. بەیاننامەکانی ئەم ڕێکخراوە لە هەموو شوێنێکی شار دەبینرێن. لە مزگەوت، لە بـازاڕ، لە مەیدانی دەستگێڕەکان، لە ماڵی مەلاکان و لە نێو لاپەڕەی دەفتەر و پەڕاوی ڕێبەری سیاسیی ئایینی ناوچەکە و هەموو شوێنێکی تر.

ڕووی پرسیارم کردە کوڕێک کە بەیاننامەی گرووپێکی سیاسی بە دیوارەوە هەڵدەواسی:

«ئـەم بەیاننامانە نـادڕێـنن، ئـازارت پێ ناگەیەنن؟»

چاردە - پازدە ساڵی تەمەن بوو، گوتی:

«نـا، هـەر کـەس بـەیـاننـامـەی خـۆی بە دیوارەوە هەڵدەواسێت».

کە دەیویست بڕوا، وەک ئـەوەی شتێکی هاتبێتەوە بیر یان بیەوێت بڵێ لە مەبەستەکەت گەیشتووم، گوتی:

«نا، لێرە بوار بە بەیاننامەی تازە موسڵمان بووەکان نادرێ. شەوانە بە قاچاغ ئەو بەیاننامانە بە دیوارەوە دەلکێنن. کەسیش نایانخوێنێتەوە. ئەو بەیاننامانە هی جاشەکانن».

دواتر لە مانای وشەی جاش گەیشتم. وشەیەکە نزیک لە «کوردفرۆش»، «بەکرێگیراو» و «سیخوڕ». حیزبی دیموکراتی کوردستان، کومیتە ناوەندییەکەی لە شەقامێک کە بەرەو سەربازخانەی مەهاباد دەچێت، جێگیر کردووە. کە سەرێکم لە نووسینگەکەی دا، بێدەنگی هەموو شوێنێکی داگرتبوو. بە پێچەوانەی ڕێکخراوەکانی تر، جموجوڵی تێدا بەدی نەدەکرا. چەند پێشمەرگەیەک لە دەوروبەری بیناکە پاسەوانیان دەدا.

ئەو سەربازخانەیەی لە نزیک دەفتەری حیزب هەڵکەوتبوو، هەر ئەو سەربازخانەیەیە کە لە سەروبەندی شۆڕشدا بە دەستی پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکرات داگیر کرا و سەرجەم چەکەکانی ناو سەربازخانەکە

بۆ حەشارگە شاخاوییەکان گوازرانەوە. بەم جۆرە حیزبی دیموکرات ئێستا خاوەنی نوێترین چەکەکانی سوپایە و ئەمەش ئیمپریالیزم و پیاوەکانی وی لە نێو دەوڵەتدا شێت کردووە. لەبەر ئەمەشە نووکی تیژی پەلاماری دەوڵەت لە کوردستان ڕوو لە حیزبی دیموکراتە. هەرچی بێ سەربازخانەکە چۆڵ دەکرێت و هەنووکە کوردەکان پێشنیار دەکەن ئەم سەربازخانەیە ببێتە زانکۆ. ئەگەرچی وێناچێت دەوڵەت وا بە سانایی پاشەکشە بکات. ماڵە دەوڵەتییەکانی دەوروبەری سەربازخانەش کەوتووەتە دەست کوردە بێ ماڵ و حاڵەکان. کوردە بێ ماڵەکان، دەستیان بە سەر ژەندەرمەری و سەربازخانەکان داگرتووە و ئێستا لە ناویاندا دەژین. دەرگا و پەنجەرەی سووتاویان بە نایلۆن داپۆشیوە و دووکەڵی دیوارەکانیان خاوێن کردووەتەوە. بەڕەیەکیان لە سەر زەوی ڕاخستووە و قیژەوهەرای دایکان و زارۆکان بیناکانیان پڕ کردووە.

شاری مەهاباد لە یەکەم نیگادا ئەو

ڕواڵەتە کوردییەی نییە کە لە شارەکانی شنۆ، سەردەشت و پیرانشار دەبینرێت. لە شارەکانی مەهاباد و سنە ئەو فەرهەنگە دەرەبەگییە خەریکە لەناو دەچێت کە لە شارە بچووکە کوردنشینەکان بەدی دەکرێت. لاوەکان لە بری جلی خۆماڵی، جلی ڕۆژ لەبەر دەکەن و قەڵافەتی مرۆڤی شارە پیشەییەکان بە خۆیانەوە دەگرن. بەم ڕەنگە، کەسی غەریب ناتوانی بە سانایی هاوڕازێک بدۆزێتەوە. ناچاری بە نێو شاردا بگەڕێیی و پاشان لە موسافیرخانەیەک لا بدەی. غەریب لێرە دڵی تەنگ دەبێت، بەڵام بێ ئاگایە لەوەی زۆری پێ ناچێ دڵ بە مەهاباد دەدا.

**دەچمە دیداری شێخ، بەڵام قسەی لەگەڵ ناکەم و بە دەستبەتاڵی دەگەڕێمەوە**

لە سەرانسەری کوردستان، وێنەکانی شێخ عیزەدینم بە دەر و دیوارەوە بینیبوو، لە ڕێگەی ڕۆژنامەکانەوە ئاشنای بیروبۆچوونەکانی ببووم، ئەو پێی وابوو گەلی کورد دەبێت

خودموختاری بەدەست بێنێت، دەبێت جیاوازی ئایینی وەلاوە بنرێن، بایەخی یەکسان بە گەلان بدرێت، وڵات بە سیستەمێکی سۆسیالیستی بەڕێوە ببرێت، گوتبووی تەنانەت ئەگەر جوبرەئیل لە ئاسمانەوە بێت و کاغەزی خودموختاری پێ نەبێت، من دەستبەردار نابم. گوتبووی بە دەستێکی ئیسلام و بە دەستێکی تری ئابووری سۆسیالیستی، با ئیمپریالیزم بەخاک بسپێرین، گوتبووی...

ئەو کەسێکە بەشداری ڕیفراندۆم نەبووە، نەچووە سەردانی ڕێبەر لە قوم هەتا بانگهێشتیان کرد و پاشان کە ڕۆیشت، پێداگر بوو هەمووان بزانن کە بۆ خۆی نەچووە، بەڵکو بە فەرمی بانگهێشت کراوە. لە زانکۆی سەنعەتی تاران وتاری پێشکەش کرد، گەنجە چەپەکان ڕێزی لێ دەگرن. ئایینییەکانی قوم و تاران و ئیسفەهان و ... ڕقیان لێیەتی، ڕۆژنامە پێشکەوتووەکان لایەنی وی دەگرن (یان بە واتایەکی تر لایەنی کوردەکان دەگرن).

لەوانە بترازێت لە سەرانسەری کوردستان گەنجەکان داوایان لێ کردبووم بچمە سەردانی.

ماڵی شێخ لە کۆڵانێک هەڵکەوتبوو کە وەک سەرجەم کۆڵانەکانی تر ڕووخابوو، ماڵەکەش لە سەرجەم ماڵەکانی تری کوردەکان دەچوو، پیاوێکی چەکدار لەبەر دەرگە دانیشتبوو، سڵاوم کرد، ڕێزی لێ گرتم.

"دەکرێت شێخ ببینم؟"

گوتی چاوەڕێ بکە، چاوەڕێم کرد، ڕۆیشت و چەند چرکەیەک دواتر گەڕایەوە:

"فەرموون".

لە دەرگەم دا و وەژوور کەوتم. دەرگەی ماڵی شێخ بە ڕووی هەموویاندا کراوەیە، ئەو بەردەوام لەگەڵ خەڵک لە پەیوەندیی دایە. چەند کەسێک لە ژوورەکەی دانیشتبوون. لە ڕۆژنامەکانەوە قەڵافەتی شێخم دەناسی، خەریک بوو بە تەلەفۆن قسەی دەکرد. مێزەری لەسەر نەبوو، عەبایەکی لەبەر دابوو. دەسحێبێکی بێ ڕاوەستان دەگێڕا. لەگەڵ پارێزگای "ئازەربایجانی ڕۆژئاوا" دەئاخفی،

بابەتی قسەکانیان شەڕی سێرویَ بوو. پێداگر بوو کێشەکان بە وتوێژ چارەسەر بن و سوپا نەچێتە ئەویَ، جەختی دەکردەوە کە ئێمە خوازیاری شەڕ نین، شەڕمان ناوێت، پیاوەکانی حەسەنی لە دەوروبەری سێرویَ دووربکەنەوە، کوردەکان و تورکەکان پێکەوە بنکەی سەربازی بەڕێوە ببەن.

هەموویان بە ڕێزەوە دانیشتبوون، زۆر خۆمانە. شێخ، پێشنوێژی هەینی مەهاباد بوو، چەندان ساڵ لە دێ ژیابوو، بێجگە لە کتێبی ئایینی، کتێبی ئەوانی تریشی خوێندبووەوە.

ڕۆژنامەیەکی چاپی عەسر، داخویانیی چەند فەقێیەکی قومی بڵاوکردبووەوە، لەو بەیاننامەیەدا پەلاماری شێخیان دابوو نووسیبوویان "چ پێویستە ئەم مەلا کوردە نووسراوەکانی لینین کاوێژ بکات و وتەکانی مارکس بڕشێتەوە". کز و کەڵەگەت بوو. ڕێشێکی درێژ و خۆڵەمێشی هەبوو. بە ڕواڵەت پەنجا و پێنج، پەنجا و شەش ساڵی تەمەن بوو. دەسحێبەکە خێرا خێرا بە نێو

قامکەکانیدا دەسوورِایەوە، دەچووە سەرێ و دەهاتەوە خوارێ، کۆ دەبووەوە، خوولی دەخوارد، لێک دەبووەوە، بەرز دەبووەوە و دیسان بەردەبووەوە نێو لەپی دەستی، ئەمەش بە دڵنیاییەوە لە بەر ئەوە بوو کە پارێزگا لە کەلی شەیتان دانەبەزیوە و شێخ توورِە بووە.

شێخ، پیاوێکی توندوتۆڵ بوو. نیشانی دەدا کە بە سانایی دەتوانێت چەخماخی کلاشینکۆفێک رِابکێشێت و لە پشت بانی ماڵەکەی سەنگەر بگرێت. قسەکانی بە تەلەفۆن تەواو بوون، سەیرێکی منی کرد، سمێڵە چرِەکانی بینیم، پێکەنی، دەستێکی بە سمێڵی داهێنا و گوتی:

"بەخێر بێن".

ویستم قسەی لەگەڵ بکەم، شتێک بڵێم، پرسیارێ بکەم، بە خۆمم گوت چ پێویستە، بۆ ناکرێت لە شوێنێکیش قسە نەکەی، بیروبۆچوونی شێخ دیارە، رِۆژنامەکان زۆریان وتوێژ لەگەڵ کردووە. گیروگرفتی کوردەکانم لە زاری خۆیانەوە بیستووە، ئیتر چ پێویستە

قسەی زیادی بکەم، بۆیە بێدەنگ بووم. بەڵام نا، وا نییە، خەریکە درۆ دەکەم. من زاتم نەدەکرد لەگەڵ شێخ قسە بکەم، بە لامەوە ئەستەم بوو، خۆم بچووک دەهاتە پێش چاو، چەند جار ویستم شتێک بڵێم، بەڵام بیرم کەوتەوە شێخ ئەو جووتیارەی سەر سنوور نییە بە سانایی بچمە ناو مەزراکەی و باس و خواسی لەگەڵ دابمەزرێنم. لەوێ دەمتوانی بێ ئامانج قسەیەک بکەم، بێ مەبەست پرسیارێک بورووژێنم، یان لە ناکاو لەسەر سفرەکەی دابنیشم و ڕووهەڵماڵراوانە نیوەی خواردنەکەی نیوەڕۆی بخۆم. پێم وابوو مەسەلەی شێخ شتێکی ترە. ئاوا بوو بێدەنگ مامەوە.

دەنگی تەلەفۆن بەرز بووەوە، لە تێلگرافخانەوە بوو. شێخ دەقێکی تێلگرافی لە پشت تەلەفۆنەوە بۆ بەرپرسی تێلگرافخانە خوێندەوە.

"لە سەید عیزەدین حوسێنییەوە

بۆ جەنابی بازرگان سەرۆک وەزیرانی شۆڕشی ئێران".

بابەتی تێلگرامەکە شەڕی سێرووی، چۆڵبوونی شاری مەریوان و کۆچی خەڵک بۆ چیاکان، ڕووداوەکانی سەردەشت، نیگەرانی گەلی کورد و تاوانەکانی حەسەنی بوو. هەروەها هاوار، هاوار کە کورد جیاخواز نییە و شەڕی ناوێت، ناوێت، ناوێت.

شێخ ئاماژەی بە من کرد و سەری ڕاوەشاند، یانی هەست بە بوونی میوان دەکات، بەڵام چار چییە، سەرقاڵم، منیش سەرم ڕاوەشاند، یانی دەبینم، تکا دەکەم، درێژە بە کارەکەتان بدەن.

کەسێکی دانیشتووی ماڵێ ڕادیۆیەکی گچکەی بۆ شێخ هێنا و بە کوردی شتێکی گوت، بۆم دەرکەوت دەنگی شێخە لە ڕادیۆی مەهابادەوە پەخش دەکرێت، شێخ پەیامی بۆ خەڵکی کوردستان دەخوێندەوە، ڕادیۆکەی نزیک کردەوە و بە سەرنجەوە گوێی ڕاداشت. زۆر بە کەمی لە قسەکانی گەیشتم، هۆشداری بە خەڵک دابوو ئاگادار بن شەڕمان بە سەردا نەسەپێنن و داوای لە کورد و تورکەکان

کردبوو وەک چۆن بەردەوام برا بوون، هەروا برا بمێننەوە.

کە پەیامەکە خوێنرایەوە، شێخ چاوێکی بە بەشداربووانی ژوورەکەدا خشاند، کاتێک بینی هەموویان بە نیگایان قسەکانی پشتڕاست دەکەنەوە، خۆشحاڵ بوو بزەی هاتێ. بە بیرم هاتەوە بە چ شەوقێکەوە وتوێژەکانیم لە ڕۆژنامەکاندا دەخوێندەوە و وێنەکانی بە چ شکۆیەکەوە چاپ دەکران. شێخ دیسان لە منی ڕوانی، چاوەڕوان بوو ئەم میوانە، بەم ڕواڵەتەی کە وێدەچوو سەر لە زۆر شت دەربکات، شتێک بڵێت، پرسیارێک بکات، بەڵام میوانەکە هەروا لە خەمی خۆی دابوو. شێخ کە بینی میوانەکە نایەوێت قسە بکات، ئەو ڕۆژنامانەی هێنایە پێشێ کە تازە بۆیان هێنابوو. لاپەڕەکانی هەڵدانەوە، کە گەیشتە بەیاننامەی فەقێکانی قوم، بابەتەکەی خوێندەوە، پاشان وەک ئەوەی بزانێت منیش خوێندومەتەوە، سیلەی نیگایەکی تێ گرتم و جۆرێک پێکەنی کە هەستم کرد دەیەوێت بڵێت:

"چی به سەر چییەوە؟ ئەم قسانە یانی چی؟"

بە نیگا هاوخەمیی خۆمم دەربڕی و هەوڵم دا تێی بگەیەنم:

"قەی ناکا، لێیان گەڕێ با بە دڵی خۆیان قسە بکەن".

کە بینی هاوخەمی ئەوم، سەری بە سەر ڕۆژنامەکەدا شۆڕکردەوە و دیسان دەسحێبەکەی سووڕاندەوە.

کوڕی شێخ کارەکانی جێبەجێ دەکرد. چایچی، پەیتا پەیتا چای بۆ ئەو کەسانە دێنا کە دەهاتنە دیداری شێخ. کوڕێک وە ژوور کەوت، دە دوانزە بەیاننامەی لە بەردەم شێخ دانا. شێخ خێرا ڕۆژنامەکانی کۆ کردەوە. بەیاننامەکانی هەڵگرت، دەسحێبەکەی دەستی لە جووڵە کەوت. بە دە خوولەک سەر لە بەری بەیاننامەکانی هەڵسەنگاند. پێم خۆش بوو بەیاننامەکان بخوێنمەوە. چاوێکم لە شێخ کرد، یەکسەر لە مەبەستەکەم گەیشت. بەیاننامەکانی لە پێش من دانا، وەک ئەو خێرا

خێرا پێیاندا هاتمەوە، دوو - سێ بەیاننامە هی ڕێکخراوی پارتیزانە فیداییەکانی گەلی ئێران - لقی کوردستان، دوو بەیاننامە هی ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان و چەند بەیاننامەیەکیش هی حیزبی دیموکرات بوون.

پارتیزانەکان نووسیبوویان "حیزبی دیموکرات دەبێت هەڵوێستی خۆی سەبارەت بە قیادە موەقەتییەکان نیشان بدات".

کە بەیاننامەی پارتیزانەکانم دەخوێندەوە، شێخ سەری رادەوەشاند، وەک ئەوەی خۆی بەیاننامەکە دەخوێنێتەوە و هاوکات پشتڕاستی دەکاتەوە.

حیزبی دیموکرات، ڕێپێوانی سنەی بە جووڵەیەکی چەپڕەوانە لە قەڵەم دابوو ڕەتی کردبووەوە. دەبێت شێخ لەم نووسینە تووڕە بووبێت، چونکە پەیامی بۆ خۆپیشاندەران ناردبوو سڵاوی ئاڕاستە کردبوون.

کوڕی شێخ بەیاننامەکانی خستە نێو دۆسیەی جیا جیا کە لە سەر ڕەفە

دانرابوون. هەندێک شەو، ئەندامانی ماڵێ بۆیان دەردەکەوێت شێخ لە ژوورەکەی نییە، بە سەرسامی دەچنە دەرێ و بە دوویدا دەگەڕێن، بەڵام شێخ زۆر دوور نەڕۆیشتووە، ویستوویەتی پیاسەیەک بکات، دەیەوێت هەوایەکی ئازاد هەڵمژێت، بیربکاتەوە، بەیاننامەکانی سەر دیوار بخوێنێتەوە. ئەم کارەش دەکات، بەردەوام چاویلکەکەی دەجووڵێنێتەوە، سەری دەباتە پێشێ و دەیهێنێتە دواوە تاوەکوو لە ژێر شۆقی چرای دارتێلێک بەیاننامەیەک بخوێنێتەوە کە هێشتا نموونەیەکیان بۆ نەهێناوە، شێخ هەموو هۆش و زەینی لە سەر بەیاننامەکەیە، یان دەستەکانی لە پشتەوە گرێ داوە، سەری بەرداوەتەوە و هەروا بە درێژایی شەقامدا پیاسە دەکات کە ئەندامانی خێزان بە هانکە هانک و شەلاڵی ئارەق خۆی دەگەیەننێ و بە تۆبزی دەیبەنەوە ماڵێ.

شێخ خەریکە لەگەڵ میوانەکانی قسە دەکات و بە سەرنجەوە گوێ بۆ قسەکانیان

ڕادەدێرێت. لە شارەکانی دیکە لاوەکان بۆیان گێڕابوومەوە:

"شێخ ناهێڵێت چەند خوولەکێک لە لای دابنیشین. کە بۆ کارێک دەچینە لای و دەمانەوێت قسەی لەگەڵ بکەین، پاش ئەوەی بە سەرنجەوە گوێ لە قسەکانمان دەگرێت، دەڵێت: زۆر باشە، هەستن، هەستن بڕۆن. چیتر لێرە دامەنیشن، بڕۆنەوە بۆ گوندەکانتان، درەنگە، هەستن بڕۆن".

لاوەکان دەیانگوت:

"هەر کە هەندێک درەنگ وەخۆ دەکەوین، شێخ وەک ئەوەی بەسەر کوڕەکەی دا هاوار بکات، تووڕە دەبێت و دەڵێت: هێشتا هەر لێرە دانیشتوون، هەستن بڕۆنەوە بۆ گوندەکانتان. لێرە دانیشتن هیچ گرفتێک چارەسەر ناکات. باشە بۆ پۆلپۆل دێنە ئێرە، بۆ لێرە چ باسە، بۆ چما ئێوە کاروبارتان نییە؟ ئەگەر گرفتێک هەیە، ئەگەر کێشەیەک هاتبێتە پێشێ، مرۆڤ کەسێکی دەنێرێت، پێویست ناکات پۆل پۆل بێنە ئێرە، زوو بن، بڕۆن بە دوای کاروبارەکانتاندا، درەنگ دەبێت".

لاوەکان دەیانگوت:

"ئێمە لە خۆمان ڕانابینین بچینەماڵی شێخ، بەس ئەو کاتانە دەچین کە بە ڕاستی ڕێگەیەکی ترمان لە بەردەم نەمابێت و چارەسەرکردنی کێشەکە مەحاڵ بێت".

شێخ لە نێو دڵی هەموو کوردەکان دایە.

کاتێک ئەندامانی حیزبی دیموکرات دەیانەوێت خەڵکی دێ بۆ فڵان ڕێپێوان یان فڵان وتار بێننە شار، دێهاتییەکانی ئەندامی حیزبی دیموکرات هەرچەند بێ چەند و چوون پەیڕەوی لە حیزب دەکەن، بەڵام سەرەتا دەپرسن:

"شێخ گوتوویەتی ئێمە بێینە شار و ڕێپێوان بکەین؟"

"شێخ گوتوویەتی ئێمە بێینە شار و گوێ لەو وتارە بگرین؟"

خەڵکی دێ پێیان وایە دەبێت هەموان ئەندامی حیزبی دیموکرات بن، چونکە شێخیش بە ئەندامی حیزب دەزانن. ئەندامانی حیزب ئەم هەڵە دەقۆزنەوە و کەڵکی ئاوەژووی لێ وەرناگرن.

بەم جۆرە شێخ فاکتەری یەکێتیی و یەکگرتوویی سەرجەم هێزەکانە لە کوردستان، ئەو زۆر جار بە هەر نرخێک بووبێت ئەم یەکێتییەی لە سەر پێ هێشتووەتەوە کە لە سەر لێواری لە ناو چوون بووە.

ئەو ڕۆژەی پەیکەری شای هەڵاتوو لە مەیدانی گەورەی شاری مەهاباد دەڕووخێنن، خەڵک دەڕژێنە نێو شەقامەکان، بە دەم دروشم دانەوە خۆ دەگەیەننە ناوەندی شار و دەیانەوێت لە سەر ئەو ستوونە بەتاڵەی پێشتر پەیکەری شای لە سەر دانرابوو، شتێک بچەقێنن، ئاینییەکان پێداگرن لە سەر ئەوەی ئاڵای کەسکی ئیسلام هەڵبدەن، گەنجە کۆمۆنیستە توندڕەوەکان دەیانەوێت ئاڵای سووری کۆمۆنیزم لەوێ بشەکێنەوە، لەم نێوانەدا لاوێک دەچێتە نێوەڕاستێ و دەڵێت "ئێمە دەبێت یەکگرتوو بین"، پاشان بە دەستێک ئاڵای ئیسلام و بە دەستەکەی تری ئاڵای کۆمۆنیزم بەرز دەکاتەوە، بە پەیژەدا دەچێتە سەر و هەردووک ئاڵاکە لە تەنیشت

یەکتری لە سەر ستوونەکە دەچەقێنی. چەپەکان ڕازی دەبن، بەڵام ژمارەیەک لە لایەنگرانی ئاڵای کەسک دەست دەکەن بە دروشم گوتنەوە، دەڵێن نەمان بۆ کۆمۆنیزم و بە پەیژەکەدا سەردەکەون، ئاڵای سووری کۆمۆنیستەکان فڕێ دەدەن، شەڕ و پێکدادان ڕوو دەدات، کەسێک هەڵتەک هەڵتەک خۆ دەگەیەنێتە مزگەوتی شار، شێخ خەریکە قسە دەکات. کەسەکە هاوار دەکات شێخ خەڵک ئەوە یەکتری دەکوژن.

شێخ بە پێخواسی لە مزگەوت دێتە دەرێ و خۆ دەگەیەنێتە مەیدانی شار. دۆخێکی سامناکە، هەموویان دەستەویەخەی یەکتری بوون. شێخ دەچێتە نێوەڕاستی مەیدانەکە. مەهابادییە تووڕەکان لێک دەکاتەوە و هاوار دەکات:

"ئەمە چ دۆخێکە دروستتان کردووە، ئەوە چ قوڕێکە خەریکە بۆ خۆمانی دەگرنەوە؟"

سەر و سیمای شێخ خوێناوی بووە. دیسان هاوار دەکات:

"ئەوە چ دەکەن؟"

ئایینییەکان پاشەکشە ناکەن، ئاڵای سووری کۆمۆنیستەکان بە عەرزیدا دەدەن، دەیخەنە ژێر پێیان. لاوە کۆمۆنیستەکان دەگوڕێنن. شێخ پەلاماری ئاینییەکان دەدا. دەکەوێتە بن دەست و پێیان، ئاڵا سووورە قوڕاوییەکەی کۆمۆنیستەکان لە بن پێڵاوی ئایینییەکان دەردێنێت و بەسەریاندا دەگوڕێنێت. ئاینییەکان دەست هەڵناگرن، کۆمۆنیستەکان هەروا توورەن. شێخ ئاڵای سووری قوڕاوی بە سینگییەوە دەنێت و بەرەو لاوە کۆمۆنیستەکان هەنگاو دەنێت، بە پەلە پەل و بە پەرۆشەوە ئاڵاکە دەتەکێنێت، ماچی دەکات، لە سەر چاوی دادەنێت، لە سەر سەری دادەنێت، دیسان ماچی دەکاتەوە و بەم کارەی دڵی لاوانی شار دەشکێت.

گریان بەر قوڕگی شێخی گرتووە، بەڵام فرمێسکەکانی نایەنە دەر، هەروا ئاڵاکە دەتەکێنێت و بە سینگییەوە دەنووسێنێت.

ئاینییەکان حەپەساون. کۆمۆنیستەکان چاویان پڕ بووە لە ڕۆندک. شێخ بە عەبای خوێناوییەوە بە پەیژەکەدا سەردەکەوێت، ئاڵای سووری کۆمۆنیستەکان لە تەنیشت ئاڵای کەسکی ئاینییەکان دادەنێت و لە پەیژەکە دێتە خوارێ. ئێستا ئیتر کوڵی گریانی هەستاوە و دەگری.[4]

لەگەڵ ئەوانە هەستامە سەر پێ کە هاتبوونە زیارەتی شێخ و ئێستا دەیانویست بڕۆن. شێخ لە بەریان هەستا. تەوقەیان لەگەڵ هەموویان کرد، دەستی منیشی گووشی. هەموویان ڕۆیشتن، شێخ پێی گوتم:

"ئێوە دانیشن".

هیچم نەگوت، بێدەنگ لە شوێنەکەی خۆم دانیشتمەوە.

---

4 شیکردنەوەیەکی زۆر گرنگ بۆ ئەوەی پیاوانی کۆنەپەرستی دڵخۆش نەبن: شێخ عیزەدین پیاوێکە بە تەواوی مانا ئایینی و خزمەتکاری ئیسلام. ئەو بڕوایەکی تایبەتی بە ئەبوزەر و خەباتگێڕانی سەردەمی ئیسلام هەیە. شێخ باوکی خەڵکانێکە کە لە کوردستان ستەمیان لێ دەکرێت.

شێخ لە پشت پەنجەرەکە ڕاوەستا و سەیری دەرەوەی کرد. بۆم دەرکەوت بیر لە شتێک دەکاتەوە، دەسحێبە زەردەکە خێراتر لە نێو قامکەکانیدا سووڕا.

دیارە ئەم دەسحێبە لە کوردستان چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشی هەیە. لە هەموو شوێنێک هەیە، لە گیرفانی گەورەی شەڵوارە فشەکاندا دەبینرێت. لە قەراغ شەقامەکان، ڕەنگ و چەشنی جۆراو جۆری لێ دەفرۆشرێت. دەسحێبی دەنک درشت، دەسحێب بە ڕەنگی ئاسمانی، شینی ئاسمانی، لە ڕەنگی مێزەری پیاوانی شاخ، پیاوانی چەکدار، دەسحێب لە ڕەنگی جلی ژنانی کورد (ئەو ژنانەی لە مەزراکان کار دەکەن)، زەرد، قاوەیی، پرتەقاڵی، نارنجی، شیری، گوڵگوڵی، کارەبایی، ئەو دەسحێبانەی دەتوانن بە خێرایی بخولێنەوە، خول بخۆن، بگەڕێن، بەرزبنەوە، بێنە خوارێ، دووربکەونەوە و هەمدیس بێنەوە نێو لە پی دەست، ئەو دەسحێبانەی...

**هەرچی کورد بیانەوێت، منیش دەمەوێت**

لە دەرەوەی شاری مەهاباد (بەرەو میاندواو)، لە شوێنێک، لە داوێنی گردێک، چەکفرۆشەکان هەندێک کەوێڵیان بە لقوپۆپی درەخت، یان پلاستیک دروستکردووە و لەوێ چەکوچۆڵ دەفرۆشن. بە تەکسی لە شار دەچمە دەر و سەرێک لەو کەوێڵانە هەڵدێنم.

منداڵی دە ساڵانە کە هاوتەمەن و هاوقەڵافەتەکانیان لە تاران بنێشت و نانقەیسی دەفرۆشن، چەند دەمانچەیەکیان بە دەستەوە گرتووە و وەک ئەوە وایە بڵێن "نانقەیسی، نانقەیسی".

"سێ تمەن، سێ تمەن، دەمانچەی ئەڵمانی سێ تمەن".

لەو لاشەوە کورێژگەیەک هاوار دەکات:

"فیشەکی ژێ-3، فیشەکی بڕنوو".

کوڕێکی مێرمنداڵ چەند قومبەلەیەکی خستبووە نێو کۆشی و بە نێو کڕیارەکاندا دەگەڕا، گازی دەکرد: "قومبەلە، قومبەلە، 180 تمەن، 180 تمەن".

بە دووی گەنجێکی دێهاتی کەوتم کە دەیویست دەمانچەیەکی ئیتالی بکڕێت، بۆ ئەوەی بزانم چ دەکات. بە مەبەستی کڕینی ئەم جۆرە دەمانچەیە سەری بە چەند کەوێڵێکدا کرد. ڕواڵەتی لە هی کرێکارێکی خانووبەرە دەچوو کە ئێواران شەکەت و هیلاک دەگەڕێتەوە، لە نانەواخانەیەک نانێک دەکڕێت، بە تمەنێک سکی خۆی تێر دەکات و هەر لەوێ لە بن دیوار بۆی دەخەوێت. شەڵوارێکی گوشادی ڕەشی لە پێ کردبوو. پێڵاوەکانی شڕ و دڕ بوون و کراسەکەی لەو کراسە ڕەنگینە دوانزە تمەنییانە دەچوو. سەراپای گیانی تۆزاوی بوو.

گەڕا، گەڕا تا دەمانچەیەکی بە دڵی خۆی دۆزییەوە. نرخی دەمانچەکە دوو هەزار و حەوسەت تمەن بوو. کوردە قاچاخچییەکە تەنانەت ئامادە نەبوو قرانێک بێتە خوارێ. گەنجەکە دواجار گوتی:

"دوو هەزار و حەوسەت و پەنجا تمەنم هەیە. بەم پارەیە دەمەوێت هەم ئەم دەمانچەیە بکڕم، هەم بەستەیەک فیشەک، هەم ئەوەندەم

پارە پێ بمێنێتەوە بگەڕێمەوە گوند و هەم بتوانم پارووە نانێک بخۆم".
پاشان هەموو پارەکەی دەرهێنا و لە بەردەم قاچاخچی دانا. قاچاخچییەکە بێ ئەملاوئەولا پرسی:
"گوندەکەتان کامەیە؟"
گەنجەکە گوتی:
"کۆنەدژ، دەوروبەریمیاندواو".
قاچاخچی بە سەر پەنجەکانی ژماردی، نزیکەی هەشتا تمەن و پێنج قڕان و دەمانچەیەکی ئیتالی و زەرفێک فیشەکی دا بە گەنجەکە و گوتی:
"جا مادام ڕاستت پێ گوتووم، ئەوەش تفەنگ و فیشەک و کرێی ڕێ و پارەی پاروویەک نان".
گەنجەکە لە خۆشیان لە جێی خۆی دەرپەڕی، بە دوی کەوتم، بەرەو گردێک چوو، ئەو شوێنەی هەر کەس چەکی کڕیبا لە وێ تاقی دەکردەوە، لە داوێنی گردەکە لە سەر عەرزی دانیشت، دەستی بە سەری داهێنا، قژی بردە دواوە، هێشتا منی نەبینیبوو، حەوت فیشەکی دەرهێنا و خستنییە

نێو فیشەکگیری دەمانچەکەوە، بێ ئەوەی پەلاپیتکە دابگرێت، تاقی کردەوە. حەوت جار چەخماخی دەمانچەکەی ڕاکێشا و حەوت گوللە دەرپەڕین. کەوابێت دەمانچەکە عەیبی نەبوو. لەبەر خۆیەوە شتێکی گوت، سەری وەرسووڕاند، منی لە پشتەوە بینی، کەمێک ترسا. بە پێکەنینەوە گوتم:

"باشە؟"

گوتی:

"بەڵێ، باشە".

پرسیم:

"دەمانچەت بۆ چییە؟"

گوتی:

"دز زۆر بوون، شەوانە دێنە سەر نامووسی خەڵکی، دەبێت شتێکت پێ بێت".

زانیم درۆ دەکات، پرسیم:

- وەرزێڕی؟
- بەڵێ، وەرزێڕم.
- باشە داهاتت چەندە دوو هەزار و حەوتسەت تمەن دەدەی بەم دەمانچە بێت کەڵکە ئیتالییە؟

ئێستا ئیتر دەمانچەکانم دەناسی، پیاوەکە لە بری ئەوەی وەڵام بداتەوە، پرسی:

- پیاوی دەوڵەتێی؟
- نا، میوانم.

دەمانچەکەی بە ئەرخەیانییەوە خستە نێو گیرفانی شەڵوارەکەی، هەستم کرد متمانەم پێ دەکات. پرسی:

- منداڵی تارانی؟
- بەڵێ.

گوتی:

"ئەمنیش هاتوومەتە تاران، کرێکاریم کردووە. هەموو کارێکم دەکرد، حەوزەکانم بەتاڵ دەکرد، هەموو کارێک..."

ئەوسا بە شەوقەوە بەردەوام بوو:

- گۆڕەپانی شەهیادیش شارەزام. ناوەکەیان گۆڕیوە؟
- بەڵێ، گۆڕیویانە.
- کردوویانە بە چی؟
- گۆڕەپانی ئازادی.

پێکەنی:

- پاركی شاریش شارەزام. زۆر لەوێ خەوتووم. ناوەكەیان نەگۆڕیوە؟

- نا، نازانم.

گوتی:

"درۆم كرد، ژن و منداڵم نییە. تەنیا خۆمم. ژنم نییە، پارەم نییە. كوردەكان چل هەزار تمەنیان دەوێت بۆ ئەوەی كچت پێ بدەن".

بیست و حەوت ساڵێكی تەمەن بوو، چاوەكانی تێك چووبوون، سوور هەڵگەڕابوون، بە قووڵدا چووبوون:

"ئەمساڵ نەهاتمە تارانێ ئیش بكەم، كار نەبوو، قەرەباڵغ بوو، پارەم نەبوو، كەسم شك نەدەبرد. عەرزێكی بچووكم هەبوو، فرۆشتم، چەكم پێ كڕی، فرۆشتمەوە و كڕیمەوە، هەموو جارێك پەنجا تمەنێكی خێر بوو. كار نییە ئیتر ناچارم".

پاشان بەردەوام بوو:

- تاران زۆر باشە. لەوێ كار زۆرە. من هەموو كارێكم پێدەكرێت، دەتوانم حەوزەكان خاوێن بكەمەوە، فەرشەكان ڕاتەكێنم،

حەمباڵی بکەم، بەڵام لێرە کار نییە، لێرە هەر کەسە و چەکێکی هەڵگرتووە و داوای خودموختاری دەکات.

- تۆ خودموختاریت ناوێت؟

وە لاڵەپەتی کەوت:

"بۆچی نا، ئەمنیش خودموختاریم دەوێت".

پرسیم:

- خودموختاری چییە؟

- وەڵڵا نازانم.

پێ کەنی، منیش پێ کەنیم. ئینجا پێکەنینەکەی بوو بە قاقا. کە پێکەنینەکەی تەواو بوو، فرمێسک لە چاوە سوورهەڵگەڕاو و تێکچووەکانی قەتیس مابوون. ئاماژەی بەرەو شار کرد و گوتی:

"ئەوان چییان بوویت، منیش هەر ئەو شتەم دەوێت".

دەستی کردە نێو گیرفانی شەڵوارەکەی، دەمانچەکە لە جێی خۆی بوو. دیسان پێکەنی.

**لەگەڵ لاوەکان سەرم لە گوندەکانی دەوروبەر دا**

بەرە بەرە لە مەهاباد، لەگەڵ خەڵکانێکی زۆر ئاشنا بووم. زۆربەیان لاو بوون و هەر کامەیان ئەندامێکی ڕێکخراوێکی پێشکەوتووخوازی کوردستان بوون، پێکەوە چووینە دێهاتەکان. ئــەوان بــەردەوام لــە هــەوڵ و تەقەڵلا دان. دەزانــن دەرفــەت کەمە، کەواتە هەتا درەنگ نەبووە، ئەوەندەی دەکرێت، پێویستە خەڵک و بەتایبەت خەڵکی دێ ئاگادار بکرێنەوە. دەبێت یەکێتییەکان بەهێز بکرێن، لە کەسی بەدگومان و هەلپەرەستیان بپارێزن، دەبێت قسە بکرێت، شتەکان لەقاو بدرێن، کـردار هەبێت، ڕێگە نیشان بدرێت، نموونە بهێنرێتەوە، هۆکارەکان بخرێنە ڕوو، هــەموویــان دەزانــن خەریکە درەنگ دەبێت. هەر ئان و ساتێک فڕۆکەکان لە ئاسمانی کوردستان بەدەر دەکەون، کەواتە دەبێت دەستوبرد بکرێت.

چەند کەسێک لە ... دزەیان کردووەتە نێو یەکێتیی جووتیارانی گوندەکانی دەوروبەری

بۆکان و میاندواو. دەبێت لەو یەکێتییە ڕاو بنرێن، کەواتە پێویستە دەستوبرد بکرێت، بە هەر شێوەیەک بووە هەوڵ و تەقەڵلا بدرێت. کوڕگەل شتەکان لە هەڵلا دەدەن:

"ئەو .... دێهاتیی پۆشتە و پەرداخن. نابێت لە یەکێتییەکی تایبەت بە جووتیاراندا جێگە و ڕێگەیان پێ بدرێت. پێویستە زیاتر ڕەعیەت بێنە نێو یەکێتییەوە. جووتیارێکی بۆشناخی ڕەنج نەچێشتوو، جووتیارێکی دەست قەتماغە نەبەستوو، بە لاش خۆرە. تراکتۆری هەیە، وەک ڕەعیەت، ئاغای ناناسێت. ئەوان بۆ ... سیخوڕی دەکەن. ئەم یەکێتیانەیان بە دڵ نییە. دەبێت لە یەکێتیی دەربکرێن".

لە گوندی "حاجی عەلیکەند"ین. ئێوارەیە. خەڵک لە مەزراکان گەڕاونەتەوە. پۆلێک لەبەر دەرگەی مزگەوت دانیشتوون، هەندێکیان شانیان بە دیوارەکانەوە داوە و جگەرە دەکێشن. ئەو لاوانەی خەڵکی ئەو گوندەن و هەموو کەسێک بە ناو دەیانناسێت، بچووکترین هەل دەقۆزنەوە، قسەکانیان دەکەن، دەیانەوێت

پێش بە دزەکردنی .... بگرن، گەرەکیانە پەرە بە یەکێتییەکان بدەن، دەیانەوێت شێوازەکانی خەباتی پێشوو بۆ خەڵکی دێ شی بکەنەوە و بڵێن بۆچی سەرنەکەوتوون. بۆچی سەرەڕای ئەوەی ئەو هەمووە پێشمەرگەیەمان هەبووە و لە هەموو شوێنێک زیاتر شەهیدمان داوە، هیچمان بە هیچ نەکردووە. بۆچی لە نێو دۆخی ئاغا و ڕەعیەتدا پەلەقاژە دەکەین، لە کاتێکدا لە بنەوپاڵەوەمان، خەڵک لە دونیایەکی تردا دەژین، بۆچی دەبێت هەر لە کوورەخانەکان ئیش بکەین، چما سەرۆکی ژەندەرمەری، سەرۆکی بانک، بەرپرسی دادگا، سەرۆکی شارەوانی، بەڕێوەبەری ناحیە و قایمقامەکان دەبێت تورک و فارس بن، ئێمە بۆچی هێندە دوا کەوتووین، بۆچی ئەوەندە چارەڕەش بووین کە حەسەنیی

پۆخڵەوات وەرگەڕێتە سەر و گوێلاکمان؟

"هەمووی لەبەر ئەم مەلا و ئاغا و ئەم ... و ئەم دەوڵەتە چەپەڵەیە. لەبەر ئەوەیە چەک هەڵدەگرین، خاوێنیان دەکەینەوە، مەشق دەکەین، دەبینە پێشمەرگە. لێ نازانین چ بکەین، پێشمەرگایەتی

به تەنیا چ سوودێکی هەیە، پێشمەرگەبوون و کارکردن بۆ ئاغا چ گرفتێک چارەسەر دەکات، بوونە پێشمەرگە و پارێزگاریکردن لە مەلا بە کەڵکی چ دێت، دەبێت ئەم ...............
ئێمە حزبێکمان دەوێت لایەنی ئێمە بگرێت. کە ئەندامەکانی ڕوو دەکەنە دێ، سۆراغی ماڵی ئاغا نەکەن، نەچنە ماڵی مەلا، بێنە لای ئێمە، ڕاوێژ بە ئێمە بکەن، ئێمەی ڕەعیەت، بماندوێنن، حزبێک لە نێوان ئاغا و مەلا و ڕەعیەت و خاوەن تراکتۆردا سنوور دانەنێت، بە کەڵک نایە، ئاغا و ڕەعیەت لێکجیاوازن. مەلا و ڕەعیەت یەک نین. ئێمە دەبێت بزانین دوژمنی ئێمە ئاغایە. ئەو قسانە بێ سوودن کە بەردەوام دەگوترێنەوە و دەڵێن ئێمە کوردیین، ئێمە جیاوازیین، ئێمە خەباتگێڕین، ئێمە کوێرەوەریمان چێشتووە، ئەمانە بێ کەڵکن، ئێمەمانان یەک زوڵممان لێ دەکرێت، دوژمنێکی گەورەیە مرۆڤی وەک ئێمە لە سەرجەم وڵاتان دەچەوسێنێتەوە و ئاغاکانمان بە گژدا دەکات. ئێمە سەرەتا دەبێت بیر لە سەرانسەری وڵات بکەینەوە، داوای مافی سەرجەم خەڵکانی ئەم وڵاتە بکەین و لە پاڵ

مافی ئەم خەڵکە، داکۆکیی لە نەتەوەی خۆمان بکەین. ئێمە، ئاغا و ڕەعیەت و جاش و مەلا، مافی ئەوەمان نییە بکەوینە یەک ڕیزەوە و بڵێین ئێمەی کورد هەموومان براین. کوردەکان ناتوانن هەموویان بە یەکەوە برا بن. ئەوانەی زوڵمیان چێشتووە، برا و یەکسانن، ئەوانەی زوڵمیان کردووە، دوژمنن. ڕەعیەتی بێ زەوی و زاری ڕەنج چێشتووی کورد لەگەڵ ڕەعیەتی ڕەنج چێشتووی بەلووچ برا و یەکسانە.

لێرە کارگە درووست ناکەن، زانکۆ بوونیاد نانێن، ڕێگە دروست ناکەن، تراکتۆرمان پێ نادەن، ژەندەرمەمان لە بان سەر دادەنێن، بۆ ئەوەی نەخوێندەوار و دواکەوتوو بێ شعوور ڕابێین و منداڵەکانمان بنێرینە پێشمەرگایەتی. بۆ لای بارزانیی بەکرێگیراو، بارزانییەک کە بە خەیاڵی خۆمان ئازادیمان بە دەست دێنێت. ئینجا ئەو یاخییە بێکەسە هەمووومان بفرۆشێت، ڕۆژێک لە بەر ئیسرائیل، ڕۆژێک لە بەر ئەمریکا، ڕۆژێک لە بەر محەممەد ڕەزا شا، ڕۆژێک لە بەر دەوڵەتی ئیسلامی و ڕۆژێکی

تریش لە بەر کەسێکی دیکە. ئەمە هەمووی لە بەر ئەوەیە کە ئێمە نەخوێندەوارییین. ئاوەزمان نییە و ناهێڵن هەمانبێت. لەبەر ئەوەیە کە ئەم حیزبی دیموکراتە دەیەوێت لەگەڵ ئاغا و مەلا و جاشەکان خودموختاری بۆ ئێمەش وەربگرێت. ئێمە ئەم خودموختارییە... ئەم ئاغا و ئەم... "

لە گوندی "وەتەمیش"ین. سبەی نوێنەرانی یەکێتیی جووتیارانی سی گوندی دەوروبەری مەهاباد و میاندواو و بۆکان لەم کۆبوونەوەیەدا بەشدار دەبن. گەنجەکان لەگەڵ چەند کەس لە نووێنەران کە لە خۆیانن و ڕێوشوێنی لاوەکانیان لە لا پەسندە، قسە دەکەن، سبەی دەبێت ئەم قسانە لە لایەن ئەم نووێنەرانەوە بە بەشداری نووێنەرەکان بە هەر شێوەیەک بووبێت، بێتە زمان و تەنانەت ئەگەر پێویست بکات ئەم قسانە سەدان جار دووپات ببنەوە:[5]

"دەبێت هەموو لا بزانن کە سەرمایەدارە گەورەکان، لە پێناو بەرژەوەندیی خۆیان بە ئەنقەست ئێمەیان دواکەتوو هێشتووەتەوە،

---

5 ئەوە کاک مستەفایە قسە دەکات.

ڕێگە و بان و کارگەیان بۆ دروست نەکردووین و ئاغایان بۆ داناوین. ئەمە هەمووی بۆ ئەوەیە ئێمە تێ نەگەین، ئەگەر تێ بگەین و ئازادیمان بە دەست بێنین، ئەم کوردستانە، ئەم کوردستانی ئێران، عێراق، سووریا و تورکیایە شوێنێکە کە ئەگەر ئازادی بە دەست بێنن، دواتر بە نۆرە وڵاتانی عێراق، سعودیە، تورکیا، فەلەستین، ئەردەن، پاکستان و تاد، یەکە یەکە لە پێناو ئازادیاندا ڕادەپەڕن و خەبات دەکەن. کوردەکان گەر خوێندەوار بن و پێشمەرگەکانیان خوێندەوار رابێنن، ڕێگەی ڕاستیان نیشان بدەن و لە ڕێگەیەکی دروستدا لێک کۆببنەوە، ڕەگی مەلا و ئاغا هەڵبقەنن، بە هانای خەڵکانی ترەوە بچن، دەستی هاریکاری بۆ کرێکاری ڕەنج چێشتوو درێژ بکەن و ئێران لە چنگ هێزە چەپەڵە بێگانەکان ڕزگار بکەن، ئەوا ئەودەم ئازادی وەک شنەبایەک بەرەو وڵاتانی دراوسێ، ئاسیا و هەر شوێنێک پێویست بێت، هەڵدەکات".

ئەو چەند نوێنەرەی خەڵکی دێ کە لاوەکانیان قەبووڵە و کاریان لەگەڵ دەکەن، دەبێت سبەی لە نێو نوێنەرانی تری خەڵکی دێدا قسە بکەن، ئەو نوێنەرانەی هەندێکیان سیخوڕی بۆ ... دەکەن و هەندێکیان جاشایەتی دەکەن. لە هەمووی خراوتر ئەوەیە دەبێت سبەی دەستی ئەو مەلایانەی بەردەوام هەوڵ دەدەن ئەم یەکێتییانە تێک بدەن بۆ ئەوەی خۆیان وەک هەمیشە کەیخودا و هەمەکارە بن، کورت بکەنەوە، سبەی دەبێت دەستی ئەو مەلایەی لە قسەکانی نوێنەرەکە بە خۆیدا شکاوەتەوە و لە نێو گیرفانیدا شاردویەتییەوە، بەرزبکرێتەوە و هاوار بکرێت:

"دەستەکانی ئەم مەلایەی ئێوە وەک دەستەکانی ژنێکی خەڵکی شار سپین. ئەم مەلایە بەم دەستانە ناتوانێت لە قسەی ڕەعیەت بگات. ئەم مەلایە بەردەوام مریشکی خواردووە، لە بن سێبەر پاڵکەوتووە. ئەم مەلایە بەکەڵک نایەت".

سبەی دەبێت هاوڕێیانی نوێنەر لە یەکێتیی، خاک و خۆڵی سەر ئاوەکە لابدەن و ئاوی زوڵاڵ نیشانی خەڵک بدەن.

سبەی دەبێت بڵێن بە ئەنقەست ڕێگە بۆ کوردەکان دروست نەکراوە، بە ئەنقەست بێ ئاون، دکتۆریان نییە، دەرمانیان نییە، سبەی دەبێت بڵێن ئەم دەوڵەتە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ دەوڵەتەکەی دیکەدا نییە و ئەم سوپایەش هەمان سوپای پێشوویە. سبەی نوێنەران و لاوەکان قسەی زۆریان بۆ گوتن پێیە، بەڵام گیروگرفتەکان لە چیاکان ئەستەم ترن. سبەی لاوان و دۆستەکانیان ناتوانن سەربکەون، چونکە دەیانەوێت دەستەویەخەی ئاغاکان، مەلاکان، سەرمایەداری گەورەی بێگانە و ئیمپریالیزم ببنەوە کە خوازیارە سەرانسەری کوردستان بکاتە مەکۆی کۆنەپەرستی. دەیانەوێت دەستەویەخەی جاشەکان یاخود بە واتایەکی دیکە کوردە خۆفرۆشەکان ببنەوە کە لە بەرماوی ئاغا و مەلا و پیاوانی دەوڵەت دەخۆن. لاوەکان، سبەی و ڕۆژەکانی تر و بەم زووانە ناتوانن کارێکی ئەوتۆ بکەن.

**تێبینی:**

هەفتەنامەیەکی کوردی، هۆکارەکانی دواکەوتنی کوردستانی بەم جۆرە ڕیز کردبوو:

1. نەبوونی گەشەی سەرمایەی پیشەیی نێوخۆیی لە بەر هۆکاری مێژوویی و هەلومەرجی تایبەتیی ناوچەکە.

2. نەبوونی سەرمایەگوزاری دەرەکی لەبەر کەم بوونی مادەی خاو و سەرەتایی کە بۆ سەرمایەگوزاری دەرەکیی ئیمپریالیزم گرنگە.

3. ژیانی خێڵەکی و بەرهەمی مەڕومالات وەک بەروبوومێکی سەرەکیی ناوچەکە.

4. دەسەڵاتی بەرچاوی دەربەگەکان کە زۆربەیان گەورە و خانی عێڵ بوون.

... بە شێوەیەک کە ئەمڕۆکە لە کوردستان دەتوانین تەنیا ئاماژە بە چەند کوورەخانەیەک و چەند کارگەیەکی موووزاییک و کارگەی فەرشچنین بکەین کە ناکەونە خانەی بەرهەمی کشتوکاڵ و مەڕ و ماڵاتەوە.

**ئایینی سوننە لە کوردستان هیچی بە هیچ نەکردووە**

کە زیاتر لە کوردستان دەمێنیتەوە و پتر لەگەڵ خەڵکی ئاشنا دەبی، بۆت دەردەکەوێت کێشە یەک و دوو نین و بۆ لەناوبردنیان پێویست بە ناسینی ڕێگە، لە خۆبوردوویی، پەروەردە، هۆشیارکردنەوەی خەڵک و ڕێکخستن دەکات. ناتوانی یەک چارەنامە بۆ سەرانسەری کوردستان بنووسی. شوێنی وا هەیە ئاغا هێشتا دیوەخانیان هەیە و نۆکەر و قەرەواش بەرامبەریان دەست لە سەر سنگ ڕاوەستاون. شوێنی وا هەیە ئاغاکانیان ڕاو ناوە. لە هەندێک شوێن موڵکداری بچووک دەسەڵاتیان بە دەستەوەیە. لە هەندێک شوێن، خەڵکی بێ زەوی کار بۆ ئەوانی تر دەکەن، لە هەندێک شوێن، ئاغاکان لەگەڵ دەوڵەت هاوپەیمان و هاودەستن، شوێنی واش هەن ئاغاکان بە تۆبزی خەڵکی دێ دەنێرنە شەڕی دەوڵەت.

لێرە، ئایینی سوننە، بە هۆی ئەوەی نەیتوانیوە خۆی لەگەڵ کێشەی ڕۆژانەدا

بگونجێنێت (بۆ نموونە وەک ئایینی شیعە) و هەروەها نەیتوانیوە پێ بە پێی خەباتی گەلی کورد بێتە پێش، نەخاسمە پاش ئەوەی نەیتوانی عیلاجێک بۆ ئەو هەموو زوڵمە بدۆزێتەوە وە لا نرا، کە لە گەلی کورد دەکرێت. ئایینی شیعە هیچ نەبێت ڕواڵەتە جڤاکییەکەی لە زۆر بۆنەی وەک لەدایکبوون، مردن، ساڵیادەکان و ....دا پاراستووە و هەر کاتێک پێویست بووبێت ئەم لایەنە کۆمەڵایەتییەی بەکار هێناوە و بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی بە گژ چەوسێنەریدا کردووەتەوە. نموونەکەی ئەو بزووتنەوە گەورانەن کە لە مزگەوتەکان دروست بوون و پەلیان هاویشتووەتە نێو شەقامەکان. کەچی دەبینین ئەم جۆرە بزاڤانە ناتوانن لە کوردستان چێ بن (لە ڕۆژانی سەرەتای شۆڕشدا، کاتێک موسڵمانانی شیعە، جەماوەری خەڵکیان لە مزگەوتەکانەوە بەرەو شەقامەکان هان دەدا، موسڵمانانی سوننە هێشتا نەیانتوانیبوو ئاڕاستەیەک بە بزووتنەوەکانیان بدەن).

هەرچی بێت ڕۆژێک مەسەلەی ئایین چارەسەر دەبێت، بۆیە دەبێت خەڵک بیر لە شتێکی تر بکەنەوە بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانیان، بۆ ئەوەی بتوانن بە هۆیەوە یەک بگرن و بیکەنە چەکێک دژ بە چەوسێنەران. مێژووی خەباتی کورد نیشانی داوە کە خەڵک دەساوێزێکی کاریگەرتر دەکەنە جێگرەوەی ئایین، ئەو دەساوێزەش نەتەوەیە.

لێ نەتەوەش بە نۆرەی خۆی گرفتی گەورە لە بەردەم بە ئاکام گەیشتنی خەباتی خەڵکی کورد دێنێتە دی. لاوەکان لە وە گەیشتوون و هەرچەند ئەستەمیش بێت، خەریکە ئەم کۆسپە هەموار بکەن.

**پێم خۆش نییە لە مەهاباد بڕۆم**

مەهاباد بەجێ دەهێڵم و دەچمە ورمێ بۆ بینینی گوندە کوردنشینەکانی تر کە بە درێژایی هێڵی سنووری ڕۆژئاوا، لە مەهابادەوە تا ماکۆ هەڵکەوتوون.

بە هیچ شێوەیەک پێم خۆش نییە لە مەهابادێ بڕۆم، ئەوێ ناوەندی هەواڵ و دەنگۆکانە. ئەگەر بتەوێت بزانی دونیا چ باسە و چ ڕووی داوە، ئەوەندە بەسە لە ماڵەوە بێیتەدەر و بە نێو شاردا پیاسە بکەی، ئەو ماوەیەی تۆ لە ماڵەوە بوویت، یان لە نێو شار نەبووی، ڕێکخراوە سیاسییەکان، هەواڵ و ڕووداوەکانی سەرانسەری کوردستان و ئێرانیان کۆ کردووەتەوە، چاپیان کردووە و بەس لە بەر تۆ بە دیوارییانەوە لکاندووە، تۆش بە پیاسەیەکی ئەم سەر و ئەوسەری شەقام لە هەموو شتێک دەگەی. هەواڵەکانی کوردستان بەر لەوەی بە ڕادیۆ و ڕۆژنامەکان بگات، بە دیوارەکانی شارەوە هەڵدەواسرێن، تۆش کە بە ڕێدا دەڕۆی، بەردەوام سەرقاڵی خوێندنەوەیت. لە سووچی کۆلانێکی، خەڵک ئاپۆرایان بەستووە، چ باسە؟ هەواڵێکی نوێ.

"سەرجەم خەڵکی قارەمانی شاری مەریوان، بەڵێ سەرجەمیان، شاریان چۆڵ کردووە و پەنایان بۆ چیاکان بردووە. بژی خەڵکی قارەمانی مەریوان."

زۆری پێ ناچێت، هەر لەوێ تێدەگەی کە:

"خەڵکی قارەمانی مەریوان شاریان چۆڵ کردووە، چونکە نایانەوێت لە شەڕ بگلێن. کوردەکان بە گشتی شەڕیان ناوێت. کاتێک دەوڵەت بەردەوام پیاوەکانی موفتیزادەی بەکرێگیراو دەنێرێتە ئەوێ، کە بەردەوام لە تارانەوە پاسدار ڕەوانە دەکات، بۆ ئەوەیە دەیەوێت دۆخێک بێتە پێش کە بە سوپا ئیسلامییەکەی لە مەریوان جۆگەلەی خوێن دروست بکات. دەوڵەت، پیاوەکانی دەنێرێتە کوچە و کۆڵانەکانی مەریوان بۆ ئەوەی منداڵێک، مێرمنداڵێک جنێو بدات، بەردێک بهاوێت، ئەوسا ئەو پیاوە زللەیەک بوەشێنێت، لە ناکاو پریشکی ئاگر بڵاوببێتەوە و شەڕ بەرپا بێت، شەڕێکی تووک لێکراو...

شارۆمەندی مەریوانی ئیتر دین دەبێت، ناتوانێت بژی، بەرگە ناگرێت، دەستی ژن و منداڵی دەگرێت و دەڵێت ئەم شارە بۆ ئێوە، بە مەردەلای شەڕ بچێت ئەم شارە، جا بە کەیفی خۆتان پیاوەکانتان لە شار بخزێنن، لەعنەت لە..."

**دیسان هەواڵ، هەواڵێکی نوێ**

"خەڵکی قارەمانی کامیاران، زامنەی قومبەلەکانیان ڕاکێشاوە، گوللەیان لە سەر پشتێن بەستووە، هاتوونەتە شەقامەکان و بە سەر سوپای بەکرێگیراودا دەگوڕێنن و دەڵێن: ئەگەر دەتانەوێت بچن خەڵکی مەریوان بکوژن، دەبێت سەرەتا بە سەر تەرمی ئێمەدا تێپەڕ ببن. خەڵکی قارەمانی کامیاران لە بن تانکەکان لە سەر عەرز ڕاکشاون. فەرماندەی تانکەکان تووڕە دەبێت، هاوار دەکات: ئێوە نەتەوەیەکی سەیرن، ڕاستە دەڵێن کورد شاخستانی و یاغین. ئەنگۆ بەڕاستی جیاخوازن. باشە بۆ هەر ئەو خەڵکە موسڵمانەی قەزوێن و هەمەدان و کرماشان نەبوون نوقڵ و شیرینیان بە سەر ئێمەدا بڵاودەکردەوە، سڵاواتیان لێ دەدا و ئێمەیان بە خودا دەسپارد بۆ ئەوەی بڕۆین و خەڵکی مەریوان خەڵتانی خاک و خوێن بکەین، ئێوەی خەڵکی کامیاران ئەو بەزمە چییە ناوتانەتەوە؟"

ئەو ڕۆژەی مەریوانییەکان شار چۆڵ دەکەن، پارێزگار واقی وڕ دەمێنێ و دەڵێت: مەحاڵە، شتی وا نابێ. ئەگەر ڕاست بێ، ئەوا دەسەڵاتێک لە پشت پەردە هەیە.

شەوی داهاتوو، تەلەڤزیۆن کامێراکەی دەخاتە سەر سیمای جاشێک و ئەو کوردە خۆفرۆشە ئێژێ: کاری کۆمۆنیستەکانە. لە دەرەوە پارەیان بۆ دێت.

سەرۆک وەزیریش جارێک گوتی: "لە شوێنێکەوە پشتیوانیان لێ دەکرێت". پارێزگار و سەرۆک وەزیران هەرچەند ئاگایان لە مەحموودی بێ زەواد نییە، بەڵام ڕاستی بۆ چوون کە دەسەڵاتێک لە پشتەوە، ڕێبەرایەتیی ئەم چالاکییە دەکات. لێ هەرگیز، هەتا ئەو کاتەی بە دەستی ئەو هێزە نەڕووخێن، لەوە ناگەن کە ئەم هێزە، هێزی جەماوەرە، هێزی لە شکان نەهاتووی زوڵملێکراوان و زەجرچەشتووەکانە کە یەکیان گرتووە، یەککگرتنێک وەک یەکێتیی جووتیارانی گوندەکانی مەریوان.

دەبێت بە نێو شاردا پیاسە بکەی، هەواڵی تریش هەن. یاسای بنەڕەتیشیان شیکردووەتەوە. ئەگەر نەتەوێت بزانی یاسای بنەڕەتی چییە و تاقەتت نەبێت تەنانەت مادەیەکی لێ بخوێنییەوە، هەر ئەوەندە بە نێو شاردا پیاسەیەکت کرد، دەبێت بە پسپۆڕێکی یاسای بنەڕەتی کۆماری ئیسلامی و کە گەڕایتەوە ماڵێ، دەتوانێت یەکە یەکە کەموکوڕییەکانی یاسای بنەڕەتی بۆ دۆستێک، ئاشنایەک، ژنێک، منداڵێک باس بکەی، چونکە ڕێکخراوە سیاسییەکان سەرجەم کەموکوڕییەکانیان دەستنیشان کردووە و بە دیواریان هەڵواسیوە.

بەردەوام بەیاننامەی نوێ هەڵدەواسرێن. ئەمەیان ئی شێخ عیزەدینە. ئێستا ئیتر دەزانم هەموو خەڵکی کوردستان ئەویان دەوێت. لە بەیاننامەکەدا نووسیویەتی:

"ڕێز و سڵاوی من بۆ خەڵکی کامیاران، خەڵکی قارەمان، سڵاوی من لە خەڵکی مەریوان..."

بەیاننامەکە هەم بە فارسی و هەم بە کوردی نووسرابوو، ئەم زوانی کوردییە چ ئاوازێکی خۆشی هەس، چ پتەوە، بڵینگۆیەک لە بان مزگەوتێکەوە داوای لە خەڵک کرد یارمەتیی دانیشتووانی مەریوان بدرێت، تۆ هەرچەند لە واتای قسەکانی ناگەی، بەڵام دەکرێت هێز و لە خۆبایی و یەکێتیی گەلێکی تێدا بدۆزێتەوە، لە وشە بە وشەی ئەو دەنگەی لە بڵیندگۆکەوە دەهاتە دەرێ، درێــژەی شـۆڕشـێک، ئـازارەکـانـی گەلێک، نیگەرانی لەو فڕۆکانەی بۆی هەبوو ئێستا نا ئێستا لە ئاسمان بـەدەر بکەون و شکۆ و پەیوەندیی گەلێک بە یەکەوە هەست پێ بکەی، ئینجا ناتوانی هیچ بکەی، ئەوە نەبێت لە جێی خۆت بوەستی، چەند جارێک ئەم دەنگە ببیسی و بیسی و تێ بگەی بۆچی دەیانەوێت زاری گەلێک بگرن و بڵێن بێدەنگ، تۆ بە زمـانـی خـۆت قسە مەکە، بە زمانی خـۆت بە هیچ شێوەیەک لە ئـازار مـەدوێ،

یان بێدەنگ بە یان دەردەکانت بەم زمانە ئەمانەتییە دەرببڕە و بانگهێشتی گەل، باس کردن لە ئازار و داواکاریی تۆڵەی خەڵکانێک کە دراونەتە بەر دەسڕێژی گوللە بە زمانێکی ئەمانەتی چ مەسخەرەیە.

دەبێت دیسان بە نێو شاردا بگەڕێی، هەواڵ زۆرن، گەلێ زۆر. دەتوانی سەرێک لە هۆڵی ڕاهێنانی جەستەیی پێشوو بدەی، لاوانی خوێندکاری مۆسیقا لە سنە ڕا هاتوون، دەیانەوێت سەمفۆنیایەکی کوردی، پارچەیەک، مۆسیقایەکی تایبەتی کوردی بژەنن. سەرت دادەخەیت و دەچێتە پێشەوە. لە کن کوردەکانی دیکە دادەنیشی، ژەنیارەکان گرووپێک لاوی هەڤدە هەژدەساڵەن، بە کەمانچە، ئۆرگ، شمشاڵ و تەپڵ دەیانەوێت ڕووداوەکانی کوردستان بژەنن.

"نەورۆزی خوێنینی سنە".

"هێرشی تانکەکان بۆ نەغەدە".

"هاواری کورد..."

کوردەکان چەپڵە بۆ ژەنیارەکانی خۆیان لێ دەدەن، بە هەموو هێزی خۆیان، ژەنیارێک دێت و باسی کوردستان دەکات، باسی کەژەکان، کێڵگەکانی گوڵەبەڕۆژە، چۆمەکان، دەشتەکان، مۆسیقا و ئازادی. کوردەکان چەپڵە لێ دەدەن.

سەمفۆنیاکە دەست پێ دەکات، تۆ هێشتا لە سەر جێگەکەت ئۆقرەت نەگرتووە کە ڕێبەر جوولەیەک دەکات و لە چاوترووکانێکدا ژەنیارەکان هۆڵی ڕاهێنانی لەش دەهەژێنن. بە نێو ئاوازی مۆسیقادا هاڕەی تانکەکان دێت و بە نێو زنجیری تانکەکاندا هاواری کوردەکان دەبیسترێت. قایم و پتەو دادەنیشی، ڕێبەر فەرمانی هێرش دەردەکا. شەستیرەکان وەدەنگ دێن، گەلی کورد و سەرجەم ئەو کەسانەی لە هۆڵەکە دانیشتوون، دەدەنە بەر دەسرێژ. شەستیرەکان کپ دەبن، ئاوازێکی دڵتەزێن لە هۆڵەکە دەبیسترێ. دەڵێتی شوانێکە و دەمەو ئێوارە، بە خەم و خەفەتەوە شمشاڵ

لێ دەدات، بەلام مایسترۆکە بوار نادا. دەستەکانی بەو پەڕی هێزەوە بەرزدەبنەوە، چەند ژەنیارێک پارچەیەک دەژەنن کە لە دەسترێژی کلاشینکۆف دەچێت، چەکەکە جارێک دەسووڕێتەوە. دوژمن خەڵتانی خوێن دەکات، گەلی کورد لە خۆشیان هاوار دەکەن. مایسترۆ، دەستووری پەلامار دەدات، کوردەکان چەک هەڵدەگرن، دەنگی دەسترێژی کلاشینکۆفەکان، پەیتا پەیتا لە هۆڵی پێشووی ڕاهێنانی لەش دەبیسترێت.

ئارەق بە جەستەی ژەنیارەکاندا تنۆک تنۆک دێتە خوار. دەڵێتی لە شەڕ گەڕاونەتەوە.

***

لە مەهابادەوە بەرەو ورمێ دەکەومە ڕێ. بە مەبەستی بینینی گوندە کوردنشینەکان دەچمە شاهپوور و خویی و ماکۆ. لەو ناوچەیە ئاغاکان هەروا دەسەلاتدارن.

# جاشەکان

ژمـارەی ئـەم کـوردفـرۆشـانـە کـەم نییە. خۆمانە لەگەڵ غەریب هەڵسوکەوت دەکەن. دەتبەنە سووچێک و بە ئەسپایی بە گوێتدا دەچرپێنن:

- لە قومەوە دێی؟
- بەڵێ، لە قومەوە دێم.
- دەستت بە...

- بەڵێ، دەستم پێیان ڕادەگات.

- سـڵاویـان بـکـەیـەنـە. بـێـژە ئێمە گیانفیداتانین. ئێمە نۆکەرتانین. وێنەکانی ئێوەمان هەیە، حەشارمان داون، ناهێڵن بە دیواریانەوە هەڵواسین.

جـاشـەکـان زۆرن، بێگانە ڕادەکێشنـە گۆشەیەک و دەڵێن:

"حیزبی دیموکرات چەکەکانی لە پشت ئەو چیایە، لە نێو ئەو ئەشکەوتەدا حەشار داوە. پێیان بڵێ با بێن دەستیان بەسەردا بگرن، بڵێ با هێرش بکەن ئێمە یارمەتیان دەدەین".

جاشەکان زۆرن.

- خەڵکی تارانی؟

- بەڵێ، خەڵکی تارانم.

- ئەمنیش تارانم زۆر خۆش دەوێت. تارانییەکان زۆر باشن. کوردەکان شاخستانین. من شاخستانی نیم. ئەمانە نەخوێندەوارن، خـەڵکی تـاران، مـاشـەڵڵا، هـەر هـەموویان خوێندەوارن. من تارانم زۆر خۆش دەوێت".

دەبێت ئاگاداری جاشەکان بی.

"ئەگەر هێرش بکەن، زۆر باش دەبێت. سوپا دەبێت خوشکی ئەمانە... خوا ئاگاداری دەوڵەت بێ، خوا..."

لە ناوچەکە، جاشەکان لە هەموو دەردێ بێ دەرمان ترن.

### سەفەرەکە نیوەچڵ دەمێنێتەوە

ئاخروئۆخری مانگی گەلاوێژە. لە سیمای هەر کوردێک دەڕوانی، دەبینی بە پەرۆشە، نیگەرانە شەڕ ڕووبدات. ڕادیۆی ئیستیعمار هاوار دەکات:

"کوردەکان لە مەترسی دان، گەمارۆیان لە سەرە، یارمەتیی کوردەکان بدەن. سوپا دەبێت بچێت و گیانی کوردەکان ڕزگار بکات".

کوردەکان مات و حەیران نوقمی ڕوانینی بێگانە دەبن، نیگایان هاوار نییە، شتێکە ئەولاتری هاوار:

"مەترسی چی، کوا ئێمە لە مەترسی داین؟"

دەستوور دراوە کەس دەنگی کوردەکان نەبیستێت.

تەلەڤزیۆن، تەلەڤزیۆنی کۆماری ئیسلامی، تەلەڤزیۆنی دژەکورد، کامێراکەی خستووەتە سەر جاشێک و لە سەرانسەری ئێران، لە سەرجەم گوند و شارەکان، دەنگی جاشەکە دەبیسترێت کە دەڵێت:

"بە هانامانەوە وەرن، ئێمە قوممان زۆر خۆش دەوێت، وەرن ڕزگارمان بکەن".

دواجار، دەرگەی سەربازگەکان دەکرێنەوە، تانکەکان بەرەو کوردستان دەکەونە ڕێ. ئەز دەشڵەژێم، ئەمێستا کوردەکان دەناسم. دەبێت کەسێک هاواریان بە گوێی ئەوانی تر بگەیەنێت.

فڕۆکە قڕێژە بۆمبهاوێژەکان لە ئاسمانی کوردستان بەدەر دەکەون، خەریکە شێت ببم.

هاوارە، هاوارە، هاوار،

من کوردەکان دەناسم، ئەوان شەڕیان ناوێت.

من دەزانم کوردەکان شەڕیان ناوێت.

هاریکاری بکەن

هاریکاری بکەن

من دەزانم

هاریکاری بکەن...

بۆم دەرکەوت باشترین ڕێگە بۆ ناسینی کوردستان ئەوەیە بڕۆم و ئەوێ لە نزیکەوە ببینم، بۆیە جانتاکەم دەست دایە و کەوتمە ڕێ، سەرەتا نەمدەزانی لە کوێوە دەست پێ بکەم، دوای ڕووداوەکان کەوتم، ڕەنگە ئەمە ڕێگەیەکی باش نەبێت بۆ ناسینی کوردستان، بەلام لەمە زیاتر هیچم لە دەست نەدەهات.

دوێنێ (1979) لە مەریوان کوشت و بڕ بووە، ڕادیۆ دەڵێت مەریوانییەکان سیانزە پاسداریان کوشتووە، دەڵێت پاسدارەکانی ئێمە خۆشاوی شەهادەتیان نۆشیوە، دەڵێت دەچنە بە هەشت و گومانی تێدا نییە لە قەراغ حەوزی کەوسەر لێو تەڕ دەکەن، ئەمنیش دەچمە مەریوان، دیارە لەوێ هەندێک شت ڕوو دەدا.


لەبلاوکراوەکانی

دەزگای ئایدیا

بۆ فکر و لێکۆڵینەوە

زنجیرە ( 288 )





2018